ناوی کتێب: کەشکۆڵی ئاغا

بەرگی حەوتەم

نووسینی: عومەری کەریم ئاغا

پیاچوونەوەی: م. عوسمان عەبدولڕەحمان

تایپو دیزاینی ناوەرۆك: چاپخانەی ئەزمەر ٠٧٧٠ ١٩١ ٦٢٥٤

دیزاینی بەرگ: چاپخانەی ئەزمەڕ ٠٧٧٠ ١٤٥ ٢٣٢٤

کوردستان – سلێمانی - چاپخانەی ئەزمەڕ

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی (١٨٩٤) ی ساڵی (٢٠٢٣)ی پێدراوە.

تیراژ: (٥٠٠) دانە



نرخی تەنها (٥) پێنج هەزار دینارە

# پێرست

# دەستپێك

سوپاسی ئەو بەڕێزانە ئەکەم کە پشتوپەنامبوون بۆ بەرهەمەکانم، خوێندنەوەیان بۆ کردووم‌و هەڵیانەنگاندووم..
نموونەیان زیادبێت، وەك بەڕێزان:

- ❋ پ.د. زاهیر لەتیف،
- ❋ نووسەرو شاعیر ئەحمەد حسێن،
- ❋ مێژووناس قادر شکاك.

لە ئاستی بەرهەمهێناندا:

- ❋ م. عوسمان عەبدولڕەحمان، پیاچوونەوەی نووسینەکان‌و دابەشکردنی وەك پێویست گرتۆتە ئەستۆ.
- ❋ مامۆستاو شاعیر تەهای حاجی مەحمود، پیاچوونەوەی چوارینەکانی گرتۆتە ئەستۆ.

خۆم بە قەرزاری هەموو ئەو بەڕێزانە ئەزانم کە سەرنج‌و تێبینی‌و هاندانیان پێبەخشیوم بۆ بەرهەمهێنان..
نموونەیان زیادبێت..

# پێشەکی پاشکۆی کەشکۆڵەکانم..

٢٠٢٢/٤/٥

بە کۆتایی بەرگی شەشەمی کەشکۆڵەکانم، بڕیارمدابوو کە کۆتـایی بــە نووسینەکانم بێنم.. بەڵام پێچەوانەکەی هاتەکایـەوە، ژیـانی ڕۆژانــەو ڕووداوو کارەســاتەکان پێــی لێهەڵکێــشام، کــە بــەردەوامبوون بەرجەســتەکەم، کاردانەوەکەی بووژانــەوەی نووســینی هێنایــە کایــەوە.. بۆیــە پەرۆشــیم بــۆ خزمەتو هەستم بۆ نووسین وزەی جووڵانی بزواندم، کە هەرچی دەردیــەری ژیان هەیە بە کاغەزەکەی بەردەمی بڕێژم، ئەویش بە ســنگی فراوانــەوە خــۆی ئاوەڵا کرد بۆ دەربڕینــی نــاخم کــە خــۆی لــە نووســینەکانما ئــەنوێنێ.. لــەو باوەڕەشدام ئەگەر تۆماری یادەوەری ڕۆژانەم نەکــەم پێنووســەکەم زویرنــەبێو کاغەزیش ئاوڕم لێنایاتەوە، کە بەرپرسی مێژووی یادەورەیــەکانن، ئــەوەش وا نەکات کــە دەســتبەرداری نووســین نــەبم، کــە ئەبێتــە مــوڵکی نەتەوەکــەم.. بەرپرسیارێتیشی ئەکەوێتە ئەستۆی نووسەرەوە، ژیانی مرۆڤیش بەرەو هەڵکشان ئەچێو وزە لاواز ئەبێ، ئەوەی ئەمڕۆ بـۆتکرا مەیخــەرە ســبەینێ، لــە هــەوڵی ئەوەشدام لە باشەوە بچم بـۆ باشــتر کــە لــە خزمــەتی گــەلو نیــشتمانابێتو جێگەیەك بگرێو تەرخانکا لە کتێبخانەی کوردی، لەو باوەڕەشــدام کــەم تــا زۆر کەموکووڕی ڕوونەدات.. بەڵام لێبوردنی ئێوە دڵخۆشم ئەکاو ئەمەوێ بە سەلامەتی لێدەرچمو سوکنایی بە دڵمابێتو گلەیی و گازندەشتان بخەمە ســەر چاوم، بە ســنگێکی فراوانیــشەوە پێــشوازیتان لێئەکــەم، داوای تەندروســتیو تەمەندرێژیتان بۆ ئەخوازم، هەموو خوێنەری بەڕێزو هاوڕێیانی کتێب..

## ئەو کەسەی ئا بیدوێنی.
## نوکتەو قسەی خۆشی لێدەبارێت!!

ئەڵبەت هونەرمەندی ناسراوی کورد، کاك **عومەری کەریم ئاغا**، لەوەتەی بیریکردۆتەوە لە دوو بواری گرنگدا درێژەی بە راژەکردن داوە..

**یەکەم:** هونەری نوواندن، باشترین و سەرکەوتووترین کەلێنی پڕکردۆتەوەو شوێنەواری بایەخداری لەبەرچاوانە تا بڵێی پێوەی ناسراوە..

**دووەم:** ئەدەب، ئەویش بە تۆمارکردنی سەدان کورتەنووسینی پەروەردەیی و ئامۆژگاری و خەرمانێك نوکتەی عەنتیکەو قسەی نەستەق و رێنمایی و دەیان مەلۆ شیعری میللیی کاریگەر بە برگەو چوارینەوە.

ئەوەی پێویستە لە دوای تەواوبوونی هەر نوکتەو نووسینی شیعرێکییەوە یەکسەر مێژووەکەیشی تۆمارکردووە، هەروەها ناوبراو خاوەنی سەدان وتەیە، کە تایبەتن بە هزرو ئەزموونی دەیان ساڵەی خۆیەوەو گشتاندویتی.

ئەوەی شایانی وتنە لەم رۆژانەدا پێشنیارێکم خستە بەرچاوی بەرێزی، کە تێکرای بەرگەکانی کەشکۆڵی ئاغا بە شێوەیەکی رازاوەی سەردەمیانە لە چەند بەرگێکی قەشەنگدا لە چاپ بدرێن و بخرێنە بۆکسێکەوە، ئینجا بخرێنە ناو بازاڕی کتێبخانەی کوردییەوە.. بەڕێزیشی زۆری پێباشبوو، هیوادارم ئەو ئاواتەشمان بێتەدی..

**ئەحمەد حسێن ئەحمەد**

(پێزان)

٢٠٢٣/٥/٢٩

# ئـاغـا........

هونەرمەنـدی بـەتواناو داهێنـەرو قـسەخۆش، لـە نێـو ئـاپۆڕای جەماوەرەکەیدا، کە پیاوێکی ڕۆحسووكو دەم بەپێکەنینە، ئـەویش هونەرمەنـد (عومەر کەریم سەعید)ە، کە نازناوی هونەرییەکەی (**عومەری کەریم ئاغا**)یە، لە ١٩٤٤/٧/١ لە شاری سلێمانی لە گەڕەکی مەڵکەنـدی، تـەرەفی پـشتی سەرای سلێمانی کۆن، کە لەو سەردەمانەدا بـە (کـارێزی ئەحمـەد زەنگەنـە) ناونەبرا، لەدایکبووە.. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی، بەشی وێژەیی هەر لە شاری سلێمانی تەواوکردووە.. لە ساڵی ١٩٥٣ بۆ ١٩٥٤ کـە لـە گەڕەکەکاندا لە ناو حەوشەو لە سەر سەکۆی قوڕیندا، لـە حەوشـەی مـاڵی (باجی عەتێ) جۆرێك لە شانۆگەری ئەنجام دەدرا لـە لایـەن شـاعیری میللـی کوردەوە (قادر برسی)و چەند گەنجێکیتر، یـەکێك لەوانـە (عومـەری کـەریم ئاغا)بوو، کە سەرەتای کاری دەستپێکردنی هونەریی بووە.. لە ساڵی ١٩٦٤ بەشداری چیرۆکی (ئافرەتو نوشتە)ی کردووە، کە لە لایەن پارێزەر (کامیـل ژیر)ەوە نوسـراوەو لەسـەر کاسـێت تۆماریـان کـردووە.. هـەر ئـەو کاتانـە ئاشنایەتی لەگەڵ هونەرمەندان (عوسمان چێوار، مستەفا ئەحمەد، کەمال سـابیرو تەها خەلیل) پەیدا دەکات.. هەروەها هاوپۆلی مامۆستا (ئەحمەد سالار) بووە..

لـە سـاڵی ١٩٦٩ بـۆ یەکـەمجار لەسـەر تەختـەی شـانۆ لـە ئامـادەیی (سلێمانی کوڕان) بەشداری لە سروودی نەورۆز کـردووە، کـە ئـەو دەمانـە فەرمانبەر بووە لە (زانکۆی سلێمانی)..

لە ساڵی ۱۹۷۰ خێزان دروست دەکات. لە ساڵی ۱۹۷۱ بووە بە ئەندامی (کۆمەڵەی هونەرو ویژەی کوردی / مەڵبەندی گشتی سلێمانی)، هەر لەو ساڵەدا بەشداریکردووە لە درامای تەلەفزیۆنی (جەنابی موفەتیش)، کە لە دەرهێنانی مامۆستا (ئەحمەد سالار)بووە، کە سەرکەوتنی بێوێنەی هەبوو.. هەر لەو ساڵەدا بەشداری دەکات لە شانۆی (چاڵی جەرگی پیرێژن)، کە لە هەولێرو بەغداد نمایشکراوە.. پاشان بەشداری دەکات لە شانۆیی (شێخی تەپلەڕەش) کە لە هۆڵی (ئامادەیی سلێمانی) نمایشکراوە.. ساڵی ۱۹۷۲ بەشداری دەکات لە درامای تەلەفزیۆنی (کێچ، بلیتو زاوا، بەڕیوەبەری نوێ، پیسکەی تەڕپیر)..

ساڵی ۱۹۷۳ کاتێ (تیپی پێشڕەو) دامەزرا، بوو بە ئەندام لەو تیپەدا بۆ ئەوەی زیاتر برەو بە کارە هونەرییەکانی خۆی بدات.. هەر لەو ساڵەدا بەشداریکرد لە درامای تەلەفزیۆنی (چەحماخە)، کە وەرچەرخانێکی گەورەبوو لە کارەکانیدا.. ساڵی ۱۹۷٤ لە شانۆگەری (پردی وڵات) بەشداریکرد کە لە بەغداد نمایشکرا.. لە ساڵی ۱۹۷٥ بەشداریکرد لە شانۆگەری (ڕەجەبو پیاوخۆران).. هەر لەو کاتانەدا لە چەندین درامای ڕادیۆییش بەشداریکردووە بۆ ڕادیۆی کوردی بەغداد لەگەڵ مامۆستا (ئەحمەد سالار)..

ساڵی ۱۹۷٦ لە درامای تەلەفزیۆنی (پاڵتۆ) بەشداریکردووە، کە ڕۆڵی وەستا (سڵێوەی خەیات)ی هەبوو.. ساڵی ۱۹۷۷ بەشداریکردووە لە درامای تەلەفزیۆنی (لالۆ کەریم).. ساڵەکانی (۱۹۷۸-۱۹۷۹-۱۹۸۰) بەشداریکردووە لە شانۆگەری (خەجو سیامەند)، شانۆگەری (ئۆتێلۆ)، شانۆگەری (ڕاپۆرت)، شانۆگەری (لالۆ ڤانیا)..

ساڵی ١٩٨١ بەشداریکردووە لە درامای تەلەفزیۆنی (ئیتر توورەنابم).. ساڵی (١٩٨٣-١٩٨٤-١٩٨٧) بەشداریکردووە لە شانۆگەرییەکانی (سەڵەی نانکەر، بەلەمی نەفەووناوی، چرا).. لە پاش راپەڕینە مەزنەکەی ساڵی ١٩٩١ بەشداریکردووە لە چەندین کاری هونەری جواندا، کە لە شێوەی (کاریکاتێر)دابوون، وەك بەرنامەی (کەشکۆڵ، هەمەڕەنگ، سابات، زانیار، بەرنامەی بەرنامە).. هەروەها لە فلیمی سینەمایی (بەهەشتی سووتاو، کلۆڵەکان، خەوخۆش) بەشداریکردووە.. ساڵی ١٩٩٨ لەسەر تەختەی شانۆ بەشداریکردووە لە شانۆیی (خزماغستان).. هەر لەو دەمانەدا لە بەڕێوەبەرایەتی چاودێری کۆمەڵایەتی، خانەی نەوجەوانان لەگەڵ هونەرمەندی شێوەکار (عومەر رەسوڵ) گرووپێکی هونەری دادەمەزرێنن، دووکاری شانۆیی ئەنجام دەدەن لە دەرهێنانی (رزگار کەریم)و (قادرۆك)..

هەروەها لە چەندین کاری تەلەفزیۆنیتر بەشداریکردووە وەك (بەرنامەی بەرنامە، شانۆیی ژیان، کراسی بەختیاری، مەتەڵی هەفتە، تۆپانێ).. هەروەها رۆڵێکی کاریگەری هەبووە لە زنجیرە درامای (فەنتەڵۆس).. ئێستاش سەرقاڵە بە رۆڵبینین لە درامای (رێحانە)..

ئەوەی جێی سەرنجی بینەرانە کە هونەرمەندی بەتوانا هیچ کات رۆڵەکانی لە نواندندا نەچوونەتەوە سەر یەکتری، بەڵکو داهێنان لە دوای داهێنان لە کارەکانیدا رەنگی داوەتەوە.. هەروەکو خۆی لە وتەیەکدا ئاماژەی پێدەکات (هیچ کات داوام لە دەرهێنەرەکان نەکردووە کە رۆڵەکەم بۆ دیاریکەن، یان ئەو کەسایەتییەم بدەنێ.. هەر کارێکم پێسپێردرابێ هێزو گوڕو حەزو ئارەزووەکانی خۆمم تیا ئاوێتەکردووە).

هونەرمەند لە بواری ئەدەبیشدا دەستی شیعرو نووسینی هەیە، تاوەکو ئێستا ئەم بەرهەمانەی بڵاوکردۆتەوە، کە تەنزئامێزن، بە ناوی (کەشکۆڵی ئاغا) کە لە دووتوێی شەش بەرگدا بەرهەم هاتوونو بەچاپگەیەنراون.. هەروەها ناملکە شیعری (ختووکە)شیان لەگەڵ هونەرمەندو شاعیر میدیا حسێن بەرهەم هێناوەو بەچاپیان گەیاندووە.. سەرجەم ئەو بەرهەمانەی کە بە چاپگەیەنراون لەسەر ئەرکی خۆی بووە، جگە لە بەرگی چوارەمی (کەشکۆڵی ئاغا) کە لە لایەن بەڕێز (د. تەها رەسوڵ)ەوە ئەرکی لەچاپدانی لەئەستۆ گرتووە. وە لە رۆژنامەو گۆڤارەکاندا چەندین کاری تری ئەدەبی نووسیوە..

هونەرمەند خاوەنی دووکورو کچێکە بە ناوەکانی (کەریم، کاژاو، کەنار) ئێستا خانەنشینەو لە شاری سلێمانی نیشتەجێیە..

بەرهەمەکانی خۆی دەبینێتەوە لە:

١) نوکتە.

٢) یادەوەری.

٣) چوارینە.

٤) وتەی بەنرخ.

٥) ئامۆژگاریو پەند.

٦) ئەمەکداریو هاوکاری..

**محەمەد کوردۆ**

**یاریدەدەری بەڕێوەبەری گشتی**

## بۆ کاکە (عومەر)ی هاوڕێی دێرینی خۆشەویستم.

**دوکتۆر حوسێن موحەممەد عەزیز**

**نووسەرو مامۆستای زانکۆ**

تەمەنم (٨–٩) سالآن بوو، جارجار لە دووکانی باپیرم (حاجی شێخ عەزیزی باراوی)، لە بازاڕی (سەلاحەدین) بەرانبەر بە شارەوانییە کۆنەکە دادەنیشتم. لە ئەو ناوە، گەلێ دووکاندارو کەسم ناسی، یەکێ لە ئەو کەسانە، لە کوڕانی خوالێخۆشبوو (کەریم ئاغا) کاك (عومەر) بوو. لە نێو بازاڕدا دووکانیان هەبوو. ئیدی کاك (عومەر)م ناسی، هەرچەندە بە تەمەن چەند ساڵێ لە من گەورەتربوو، براکانیشی خوالێخۆشبووان (بەکر)و (ئەکرەم)، هاوڕێی باوکم (حاجی شێخ موحەممەدی برینپێچ)و مامم (شێخ بەکری شێخ عەزیز) بوون. هەر لە ئەو سەردەمەوە، تێکەڵاوی لەنێوان ئەم دوو بنەماڵەیەدا درووستبوو.

کاکە (عومەر)، هەر لە تەمەنێکی زووەوە، کەسێکی رووخۆش‌و قسەخۆش بوو. پیاوێکی بەڕێزو بەڕەوشتە، کۆمەڵانی خەڵك بە نێرو مێوە، خۆشیاندەوێ‌و ڕێزی لێ دەگرن، چونکە خۆی بەڕێزەو پیاوێکی بە ئەمەکە، هاوڕێی خۆی بیرناچێ، لە نەخۆشیی‌و ناخۆشیدا، بەسەریاندەکاتەوە. بە شێوەیەکی بەردەوامیش، بەشداری لە پرسەکانیاندا دەکا. لە هەمان کاتیشدا، یەکێ لە هونەرمەندە هەڵکەوتووە دانسقەکانی کوردە. جگە لە نواندن، دەسی هۆنراوەهۆنینەوەو نووسینیشی هەیە.

لە کۆتاییشدا دەڵێم: هەتا ئەم ساتەی، ئەم چەند دێڕە دەنووسم، هەر هاوڕێین، هەفتانە سەری لێدەدەم‌و یەکدی دەبینین. هێندێ جاریش، نانی نیوەڕوان پێکەوە دەخۆین. هیوادارم، تەمەندرێژبێ، تەندرووستی باشبێ، کۆمەڵانی خەڵك لە قسە خۆشەکانی‌و هونەرەکەی، بێبەش نەبن.

٢٠٢٢/١٢/٢٥

# کاک عومەری کەریم ئاغا..!

برای گەورەم، کاک عومەری کەریم ئاغا، ئەکتەری شانۆو شاشەو ئەڵقە تەنزەکان، کە وەك قەتارەی هەوری پایز هونەرو خەندەو پێکەنینو هەست بە زەبوونیو دڵ لەخۆدامانو ئومێدو پاشەڕۆژێکی پرشنگدارتری، نەك هەر بەسەر چوار پارچەکەی کوردستان، بەڵکو بەسەر هەر چل پارچەکەیدا.. بە سویدو فەرەنساو ئەڵمانیاو بەریتانیاو... پارچەکانی تریشدا باراندووە.

وەکو نانی گەنمو چای شیرینو تەماتەی دۆستی هەمیشەیی هەژارانو.. هەواو هەتاوو سەرماو گەرماو گەنجی بێکار، لەگەڵ دەیان خەمخۆری تری وەکو خۆیدا، لەماڵی هەموومان‌دابووە..

کاك عومەری کەریم ئاغا، هەر ئەم عومەرە بووە؟ نەخێر..! زۆر عومەری تریشە، لە بەرزترینو بەنرخترین دامو دەزگای دەوڵەت، کە زانکۆیە، کارمەندبووە، لە زانکۆش نموونەی خزمەتکاری رۆڵەکانی ئەم میللەتەو کوڕو کچو خوشكو برای هەموومان بووە. بەدەمو دەستو داوێن پاکییەوە عومەرێك بووە.

نووسەر سەدان رووداوو پەندو ئامۆژگاریو هەڵوێستی جوامێرانەو پارچە شیعری پڕ واتای لە بەرگەکانی (کەشکۆڵی ئاغا)دا تۆمارو بڵاوکردۆتەوەو بەشێك لە دابو نەریتو کەلتووری کوردی تیا پاراستووە..

کاك عومەر لە سایەی عیززەتی نەفسی دەمی نەبردووە بۆ هیچ دەستێك، لەوەتەی دەستی داری گرتووە، کاسبی کردووە، کاسبییەك بەدەستپاکیو نەمانەتەوە، نە شتی ئێکسپاریەری بەکەس فرۆشتووەو نە هیندیو تورکیو

چینی لەکەس کردووە بە خۆماڵی!. بەهارات بەهاراتە، تامو بۆنو بەرامەی بە گیپەو کفتەو یاپراخان بەخشیوە..

ئاغا، عومەرێکی کۆمەڵایەتی بە جلو بەرگێکی ڕەسەنی کوردەواریو مشکیە ڕەشە چوار زەرعییەکەیەوە، لە زۆربەی کۆڕو کۆبوونەوەو بۆنەو پرسەو داواکردنو مارەکردنو شاییدا، لە ڕیزی پێشەوەی ئامادەبووانداوبوە.

لە کاتێکدا توێژێك هەڵپەیانەو زەوی دنیایان داگیرکردووەو هەرچەند نەکەن دەستیان ناگات بە ئاسمان تەلبەندی بکەن، ئەم کاك عومەرە پارچە زەوی گرانبەها، کە بە ڕەنجی فەرهادیو بە میراتی باوو باپیرانو دینار دیناری ناڵەتو زەردەچەوە پێکەوەی ناوە، ئەیبەخشێت بە حکومەت، بیکەن بە بینای دەزگایەکی خێرخوازی بە ناوی خۆیەوە، لێی وەرناگرن، چونکە بە مەرجەکانی تەریق نەبنەوە..!!

کاك عومەری کەریم ئاغا، بۆ ئەوە ئەمانەی نەکردووە، کەس بیکاتە کۆڵ، بەڵکو بۆ ئەوەی کردووە سامانێك کۆبکاتەوە، نە بدزرێت، نە بسووتێت، لە دوای خۆیشی لەناوبچێت.. وەکو نووسەرێکی ئەورووپی ئەڵێت: (ژیان ڕێگایەکی خۆڵە، گرنك ئەوەیە جێپێیەك بەجێبێڵیت، بڵێن فلان کەس لێرەوە ڕۆیشت).. نووسەرێکی تری ئەمەریکیش بە ناوی (تود هنری) لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (Die Empty)، واتە بە دەستی بەتاڵ بمرە، یانی هیچ تواناو بەرنامەیەکت نەمابێت لەگەڵ خۆت بیبەیتە ناو گۆڕ..

ئەری چی ماوە کاك عومەر لەگەڵ خۆی بیباتە گۆڕ؟!!

ئەی چەند جێپێی لەسەر توولەڕێی ژیان بەجێهێشتووە، کە ئەوەکانی ئێستاو دوارۆژ ئەڵێن عومەری کەریم ئاغا لێرەوە ڕۆیشت!!

ئەی ئەگەر وا نییە، بۆچی فـسفس پاڵەوانێك، كە وانەزانێت (بحر الميـت) ئەو كوشتوويەتی، كەس وێنەيەكی لەگەڵ ناگرێت؟! بـەڵام كـاك عومـەر لــە هـەموو هـەرێمی كوردسـتانو سـنەو سـابلاغو وانو دياربـەكرو كۆبانـیو عەفرينـەوە دێنــە بـەر دووكانەكـەی، داوای لێـەكـەن وێنەيـەكيان لەگــەڵ بگرێت؟!!

سوپاس بۆ ئەو برا پۆلیـسەش كە هـەموو جارێـك لــە كـاتی وەرگرتنـی مووچـەی خانەنـشينيدا نـەيبينم، نايـەڵێت لەسـەرەدا بوەسـتێتو ئەيكاتــە ژوورەوە..

**تۆفيق عەبدول**

**سلێمانی ٢٠٢٣**

# کەشکۆڵی ئاغا تایبەت پێکەنین بەرێت!

**حکمت معروف**

چوار رۆژە سەرقاڵی خوێندنەوەی بەرگی شەشەمی (کەشکۆڵی ئاغـا)م، کە لەلایەن هونەرمەند کاك (عومەری کەریم ئاغا)وە نووسراوە.

ئەم بەرگەی کەشکۆڵی ئاغا، لـە دەسـتپێك، لـەبری پێـشەکی، فـایلی تایبەت بە حەزو ئارەزووی راستەقینەم، پەندەکانی ژیان لـە یادەوەرییەکانمـدا، تـەنزەکانم، نەسـتەقەکانم، گەشـتەکانم، چـوارینە، پاشـکۆو وێنـەو ئـەلبووم، پێکهاتووەو لە دووتوێی (٣٣٦) لاپەڕەدا، چاپکراوە.

ئاغا، لە رێگەی ئەم کەشکۆڵەوە، تەنها بـەناو یادەوەرییـەکانی خۆیـدا، سەفەر ناکات، بەڵکو یادەوەرییـەکانی شـارێك و خەڵکەکـەی دەنووسـێتەوە. لەبارەی زۆر بابەت و رەفتارو هەنـدێکجار مێژووشـی نووسـیوە. یـەکێك لـە جوانییەکانی ئەم کتێبە، بوونی رێکەوتە، کە ئاغا بە وردی رێکـەوتی روودانـی هەمووی تۆمارکردووە. ئەمە وا دەکات، لە کاتی خوێندنەوەیدا، تۆی خوێنەر بڵێیت: ئەو کاتە من لەکوێ بـووم؟! بۆیـە تـۆش پەلکێـشی یادەوەرییـەکانت دەبیت و لەگەڵ کەشکۆڵەکە سەفەرێك بە یادەوەرییەکانی خۆتدا، دەکەیت.

یەکێك لە بابەتە یەکجار جوانەکانی کەشکۆڵ، وەسییەتنامەکەی ئاغایە، کە تێیدا چوار پارچە زەوی، بۆ دروستکردنی نەخۆشخانەیەك یان باخـچەیەکی منالآن یان شوێنێکی رۆشنبیری و هونەری و ئەدەبی، دەبەخشێت. تەنها داواشی ئەوەیە، کـە شـوێنەکە بکرێـت بـە نـاوی (عومـەری کـەریم ئاغـا)وە. ئەمـە بەخشندەییەکی یەکجار گەورەیە!.

ئاغا، دوای مەرگ، خەمی لەبیرچوونەوەی نییە، چونکە جوان بۆی دەرکەوتووە، کە لە ڕێگەی هونەرو نووسینو کارەکەیەوە، قووڵ قووڵ، بە ناو یادەوەری خەڵکدا ڕۆچووە! ئەمەش لە کاتی نەخۆشکەوتنو سەفەرو بەرکەوتنەکانی لەگەڵ خەڵکدا، بۆی روونبووەتەوە. ئاغا ئێستا تەنها خەمێك کە ڕۆژانە سەرقاڵییەتی، خەمی خزمەتکردنی خەڵکە.

ئاغا، خەمیەتی (پێکەنین) بمرێت! بۆیە، وەك خۆی لە پێشەکی کەشکۆڵەکەدا دەڵێت: (چەندین ساڵە خولیای ئەوەم بووە هەر نەبێت بتوانم خەندەیەك بخەمە سەر لێوی وشکهەڵهاتووی هاوولاتیانی نەتەوەکەم.).. بیری لێبکەنەوە پێکەنین بمرێت!! دەبێت ژیان ببێتە چ کەلاوەیەك؟! ڕۆژگارمان، ببێتە چ بەلایەك؟!

ئاغا، دنیای تەیکردووە، تا هێز بە خەندە بداتەوە، تا قاقا لە زاری ئەمەوە، بۆ زاری ئەویتر بازبداتو پێکەنین بژی.. تەنزو نوکتەکانی ئاغا، هەر بە تەنها وا ناکەن پێبکەنیت، بەڵکو یەك دنیا یادەوەریی شارت، بیر دەخەنەوە! هالاوی پڕ لە گولاوی هەناسەی شارت، بەسەردا دێتو ئەنجا، پڕ بە دڵی خۆت دەدەیتە قاقا!!

ئەمەش بەڵگەی قاقالێدان:

١- سەردانی برادەرێکی دوکاندارم کرد، تەماشامکرد کەسێکی لێبوو لە حیزبی کەران، دۆستی ئەویشبوو، دوای سلاو، وتم: لە کەیەوە دوکانەکەت بووە بە سەرەنوێڵك؟! وتی: لەو کاتەوەی ئەم کەرە هاتووە!!

٢- هاوڕێیەکم دوو ژنی هەبوو، وەعدی یامێ کە دەعوەتم نەکاو قەڵم بۆ سەرنەبڕێ، بەڵام وەعدەکەی نەبردەسەر. ناچار پێموت: پیاوی باش تۆ دوو ژنت بۆ ئەدرێ بە زەویا، کەچی قەلێکت بۆ سەرنابڕدرێ؟!

ئەمە جگە لەوەی بەشێك لە تەنزەکان وانەی جوانی ژیانکردنو خۆنەویستیو خزمەتکردنمان فێردەکەن.

ئاغا بۆ ریکلامی بازرگانی بۆ کاڵاو شتیتر ناکات؟! وەڵامێکی جوان دەداتەوەو دەنووسێت: وتیان ئاغا کاغەزی سپی ئەخەینە بەردەستت، خۆت پڕیکەرەوە، چەند ئەنووسی بینووسە، وتم: پەنجەکانم ئەو جۆرە پێنووسانە ناگرێتەخۆی!!

بەشی ئەستەقەکانی کەشکۆڵی ئاغا، پڕن لە دنیادیدەیی، هەست دەکەیت، ئاغا یەك چرکەی ژیانی بەفیڕۆ نەداوەو هەمیشە خەریکی کەڵەکەکردنی ئەو شتانەبووە، کە لە ژیانەوە فێریانبووە! بۆیە ئەم بەشەی کەشکۆڵەکەی پڕە لە فەلسەفەی ژیانو خزمەتکردن:

١- تەماحت لە هەر شتێکا نەبێ، لە خزمەتکردندا هەتبێ.

٢- لە ئاستی کەسایەتیدا، شکست بە پارە بهێنە.

٣- ژیان ئەشچێتە کۆڵی، دێتە کۆڵت!!

٤- ئەگەر ڕوو بۆ داپۆشین بوایە، خوا سەری بۆ مرۆڤ دروست نەئەکرد!!

چوارینەکانی ئاغا، زۆرینەیان ئامۆژگاریو هەندێکیان گلەییە لە دەورو زەمانەو دەسەڵات، بەڵام لە چوارینەشدا، ئاغا پێکەنینی لەبیر نەکردووە! بۆیە بە پێچەوانەی هەموو شاعیران، کە وەسفی جوانی پاییزیان کردووە، ئاغا کتومت بە چوارینەیەك وەسفی دیوەکەی تری پاییزی کردووەو نووسیویەتی:

ئەوا پایز هات بۆ کۆکەو پژمین

تەپڵو تەدارەک تەشقەڵەو ترین

خوا بکا دووربین لە میزەچورکە

هەتاکو ماوی دۆعا بۆ ترکە

دەربارەی خراپی دەسەلاتو بێمووچەیی دەڵێت:

تەسەللای دڵم بەچی بەمەوە

خەم دەوری یاوم هەر ئەتلێمەوە

خەڵکی ئەبینم بێ پارەو مووچە

نیشانم ئەیا ئەم حوکمە پووچە

لە بەشی پاشکۆو وێنەکاندا، چاوپێکەوتنەکانی لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا، لەگەڵ چەند وێنەیەك لەگەڵ کەسایەتییەکانی شاردا، داناوە.

لە دوا ڕستەکانی کەشکۆڵەکەیدا، ئاغا شادمانی خۆی بەرانبەر بە خۆشەویستی خەڵك دەردەبڕێتو دەنووسێت:

کە نەخۆشکەوتم، ئەوسا بە تەواوەتی زانیم خەڵکی منیان چەند خۆشئەوێ؟! هەر کۆچکردووەکان مابوون هەواڵم بپرسن!!.

هێندە بە خۆشەویستی خەڵك دڵخۆشو ڕازییە، کەشکۆڵەکەی بە چوارینەیەك کۆتایی پێدەهێنێتو نووسیویەتی:

دوای نەخۆشییەکەم وشە نەماوە بیکەم بە ڕستە

دەرکەوت هەموو کەسێ کەستە

خۆشەویستی خەڵک وایلێکردم

ئیتر بڵێم عومەر بەستە

ئەوەی گرنگە لە کۆتاییدا بیلێم ئەوەیە: کەشکۆڵەکەی ئاغا، پڕە لە وانەی ژیان، لە ئامۆژگاری‌و قسەی نەستەق، لە ڕێگەی پێکەنینەوە، لە کۆی کتێبەکەدا، من تەنها لە یەك شوێندا خەمباربووم، بەڵام لەم کورتە نووسینەدا باسم نەکرد! تا ئێوەی خوێنەر، خۆتان کتێبەکە بخوێننەوە، کە گەیشتنە ("ڕازی"و یادەوەرییەکی تاڵ)، دڵنیام لەبەر خۆتانەوە دەڵێن:

بەڵێ دیارە لە ناو قەومی بەسیتا قەدری سنعەتکار
وەکو عەکسی قەمەر وایە لەناو حەوزێکی لیخندا[*]

بە کاك (عومەری کەریم ئاغا)ش دەڵێم:

سوپاس بۆ نووسینی ئەم کەشکۆڵە، بۆ ئەم هەموو خەندەو ئامۆژگاریی‌و یادەوەرییانە، ئاسوودەو تەمەندرێژبیت، تۆو کەسانی وەك تۆ بژین، تا پێکەنینیش بژی‌و نەمرێت.

Hikmat Maaroof
٣٠ سبتمبر ٢٠٢٠

(*) بەیتێکی گۆران.

دوای بەخشینی بەرگی شەشەمی کەشکۆڵەکەم بە مامۆستا ئەحمەد حسێنی شاعیرو سەرنووسەری گۆڤاری سلێمانی، فەرمووی ئاغا دەسخۆشیت لێدەکەم، کە لەم بارودۆخە ناهەموارەی کۆرۆناو بێموچەییا ئەو کەشکۆڵەت بەرهەمهێناوە.. وتم بەڕێز ئەوە دەنگی سلێمانییە هیچ فشارێك ناتوانێ کپی بکات!..

٢٠٢٠/٩/١٩



ئاغا گیان، دەستخۆش بۆ ئەو چوارینە جوانانە، کە سەرجەمی هەڵقوڵاوی ناو کۆمەڵگەی کوردەوارییە.. بەسەرهاتو یادەورییەکانیش هیچیان کەمتر نییە لە چوارینەکان. هیوای سەرکەوتنت بۆ ئەخوازم، هونەرمەندو نووسەرو شاعیرە جوانەکەی نیشتمان.. بەڕێزی، یەکێکی لەو کەسایەتییانەی شار، کە هەمیشە لە خزمەتی شارو کەسانی هەژارو کەمدەرامەتدا درێغیتان نەکردووە.. سەرکەوتووبن...

تەها حاجی مەحمود

٢٠٢٢/٤/٣

# ئاغا، فرەبەهرەو رەنگینەباخە

نهێنی داهێنەر ئەوەیە سەرچاوەکانی بشاریتەوە، هەموو بریسکانەوەیەك زێڕ نییە کە بدرەوشێتەوە، ناسینی کەسانی دیکە داناییە، بەڵام ناسینی خۆت ڕۆشنایبە، زانایی‌و بەزەیی‌و ئازایەتی، تایبەتمەندن بۆ ڕەوشتی کەسایەتی. لە گرنگترین کلیلەکانی سەرکەوتن متمانە بەخۆبوونە، نەخشەدانان‌و بەرنامەڕێژی ڕاستی بیروبۆچوونە، هەموو کێشەو شەڕێك سینەمایەکی بێ بلیتە، باشترینی شەڕ لەگەڵ ژیان بەخۆشی بژی بە قاقاو حلیتە. چارلی چاپلن بە پێکەنین دونیای هێنا بە گریان، بەس بە بێدەنگی خەڵکی تێگەیاند بەبێ زمان، گریانی گۆڕی بە خەندە، بە هونەرو نواندن بەو شێوە پەسەندە، باشترین تەنزسازو کۆمیدی مێژووی سینەمای جیهان بوو، سەرکەوتنەکەی بێ وتەو جووڵەو شەپقەو گۆچان بوو، فەلسەفە بەهۆی سەرسوڕمانی مرۆڤەوە سەری هەڵداوە، بیرو بیردۆزی بێ بنەما بلقی سەر ئاوو کەفە، گیا هەرگیز نابێتە درەخت، با هەتاویش لێیدات زۆر وەخت.

بیرکردنەوە ئاسانە، کارپێکردنی گرانە، هونەرمەند هەستەکانی لە هەندێ مرۆڤ بالاترە، باخی ژیانی جوانترو ئاڵاو والاترە، ئامانج لە هونەر سەرکەوتن‌و ئازادییە، داهێنەری جوانی‌و پەندو وانەو شادییە، مرۆڤی مەزن توانای داهێنانی هەبێ، تامی ژیانی شیرین دەکاتە شیلەی هەنگوین شادمانی دەبێ، گەر لێگەڕێ ژانی ژیان‌و دەردی زەمان. خۆ هەموو مرۆڤەکان پێدەکەنن بە یەك زمان، لە کاتێکدا زمان گرنگترین شوناسی گەلانە، مەلو گیاندار بە دەنگ دەناسرێن، لە ناو دارو گوڵزارو کۆساربێ یان لە لانە، مرۆڤی خۆش زمان دوژمنی کەمە، یەك لە هۆکارەکانی باشی مرۆڤ زمان‌و دەمە. قسە ناخۆشەکان هێسك ناشکێنن بەڵام دڵ دەشکێنن، بەڵام وتە خۆشەکان خۆشی‌و پێکەنین‌و ئارامی دەروون دەهێنن.

لە منداڵدانی سلێمانی، لە گەڕەکی مەڵکەندی، ساڵی ١٩٤٤، بەچکە ئاغایەکی ڕەسەن خوا دای و کەوتەخوار، ناونرا عومەراغای کەریماغا، ڕەسەن و لە ڕێچکەیەك و وەجاغا، بە منداڵی بەهرەی لێدەباری، لە شیعرو نووسین و هونەرو نواندن و یاری، لە ناو حەوشەو سەر سەکۆی قوڕین و بەردا، بە دە ساڵی بە خۆماڵی شانۆگەری ئەنجام دەدا، دەستپێکی هونەری بوو، جۆرێك لە شانۆگەری بوو. ساڵی ١٩٦٤، لە چیرۆکی ئافرەت و نوشتە بەشداری کردووە، بەڵام لە ساڵی ١٩٦٩، بۆ یەکەم جار هاتە سەر تەختی شانۆ، ساڵی ١٩٧١ لە درامای (جەنابی موفەتیش)و لە شانۆی (چاڵی جەرگی پیرێژین و شێخی تەپڵەڕەش). ساڵی ١٩٧٢ لە درامای (کێچ، بلیت و زاوا، بەڕێوبەری نوێ، پیسکەی تەرپیر) بەشدار دەبێ و وەك ئەستێرەیەکی گەش دەردەکەوێ. دوایی لە درامای (چەخماخە، ڕەجەب و پیاوخۆران)، لە شانۆگەری (پردی ناوات)، لە درامای (پاڵتۆ)و لە ڕۆڵی سڵێوەی خەیات زیاتر دەناسرێ و دەدرەوشێتەوە.

سەرەنجام بەردەوام لە درامای (لالۆ کەریم و شانۆگەری ئۆتێلۆ و ڕاپۆرت و لالۆ ڤانیاو خەج و سیامەند)، ڕۆڵ دەبینێ و ناوبانگ زیاتر پەیدا دەکا وەکو ئەکتەرێکی لێوەشاوە. ساڵی ١٩٨١-١٩٨٧ لە درامای (نێر تووڕە نابم، سەلەی نانکەر، چراو بەلەمی ئەفسووناوی)، توانای پتر دەردەکەوێ و لە بوواری هونەری نواندن ناوی دەگەشێتەوە.

پاش ڕاپەڕین کاری هونەری جوانتر دەکاو بەشێوەی کاریکاتێرو شانۆو دراما، ڕۆڵی دیار دەبینێ لە بەرنامەی (کەشکۆڵ و هەمەڕەنگ و ساباتو خزماغستان و فەنتەلۆس و ڕێحانە و بەرنامەی بەرنامە)دا، وەك ئەکتەرێکی شایستەو لێوەشاوە خۆی گونجاندووەو شیاندووە. ئامادەی هەموو نواندنێك بووەو داهێنان و هونەری تێدا بەرجەستەکردووە. تەماشای باخچەی ئاغا بکەن جوان و ڕازاوەیە بە گوڵە شیعرو پەندو وتەی بەپیت، بە گوڵاوی وتەی خۆش و دیمەنی نواندن و تەختی شانۆو سینەمایەکی بێ بلیت، بەهرەکانی ڕەنگاڵەیی و

هەمەڕەنگە، لە شیلەی شیرین گەڕاوە لە سروشتی هەنگە. کەشکۆڵی ئاغا شەوچەرەو مشتاغە، هەوای سوعبەتی لە دەماغە، وا لە ژیان گەیشتووە لە تێگەیشتن‌و ڕوانگەی خۆیەوە لێی دەڕوانێ. ژیان بە ئەزموون‌و خەون‌و بێشەی پڕ کێشە بەدەرفەت نایەکسانی‌و شەڕێکی بەردەوام دەزانێ. بەهاری سروشت لە بەهاری تەمەن دڵگیرترو جوانترە، بەهرەو توانای ئاغا لە یەك بووار نییە، فراوانترە، کەشکۆڵی ئاغا، تێکەڵەیەکەو کەرەستەی یاپراغە، بە بۆن‌و بەرامی ناڵەت‌و بەهارات‌و قیمەو شویت، تام دەداتەوە بە چێژو خۆش لە خلت‌و لیت. گیپەو کفتەو نۆکاوو بەهارات‌و ناڵەت‌و زەردەچەوە چێشت دەکا خۆش، بەرهەمەکانی ئاغا ئەوهاش ماڵی ئەوەیە بیخۆیت‌و بیجوێیتەوە بە دڵ‌و گیان‌و هەست‌و هۆش. خۆراکی مێشك‌و دڵە نەك گەدەو هەناو، وەك سپارەی حەق پەرستی ئوستاد بەشیر مشیر بخوێندرێتەوە ناوبەناو، هەموو چرکەیەکی ژیانی ئاغا وێژەو ڕازۆو وتەی خۆش‌و هونەرو ئامۆژگارییە، بۆ بەزمی دانیشتن‌و چرای دیوەخان‌و شنەی وشەکانی ڕشتەی مروارییە. بابەتەکانی بەپێزو بەهێزن، خۆشی بەخش‌و تەنزئامێزن، وەکو دانا دەنووسێ‌و بە ئاسایی دەنەخاوت، بەهەست‌و مەبەست نیشانەی دەئەنگاوت. ئەو مرۆڤە مەزنە کە توانای داهێنانی هەبێ، خەندەو خۆشی بۆ دەرد دەرمانی دەبێ.

ئاغا جیاوازبوو لە شەوی بەرات، لەجیاتی خورماو نوقڵ‌و نەبات، تینووسی دەکردە خەڵات، ناوازەو داهێنان بوو، بۆ پەروەردەو ڕاهێنان بوو، چوار خشتەکییەکانی خشت‌و مشت‌و شت لەسەر ڕێبازو شێوازی خەیام، ئامۆژگاری‌و ئەزموون‌و وتەی خۆش‌و بەتام، پڕە لە پەند‌و پەیام. تەمەنی گەیشتۆتە هەشتا، هونەرو خامەی بەکارە هێشتا. لە داشۆرین شارەزا، وەك شاگردی شێخ ڕەزا. لە ختوکەی میدیاو ئاغا، دێڕەکانیان قاچاغ‌و یاساغا. ئاغاو هونەرمەند میدیا حسێن، لە هیمەت‌و هەڵمەتی هەناوپسێن، ختوکەی دەدەن دابەزیونەتەوە سەر قادری، شیش‌و کەبابیان سووتاندووە لە سەر ئاگری، بە قووەتی قادری، خۆی لەبەری ناگری. گەرچی دژی هەموو

ئازاردانێکە، وا لە گەردوون ڕاماوە. دەڵێت لە هەر کەس بپرسی یان نەماوە یان داماوە، مرۆڤدۆستو مەلو ئاژەل دۆستو ژینگەپارێز. دوکانی بەهاراتی هەیە، بەڵام گوڵ دەفرۆشێ بە سۆزو رێز، کاسبکارێکی پاكو حەرامی لا شەکر نییە، بەڵام حەڵاڵی لەکن تاڵیشك، بە ئارەقەی نێوچەوانو بە ڕەنجی شانو شەپیلكو ئانیشك، پارەو سامانو ماڵی پەیداکردووە بە حەڵاڵی. زەوی کڕیوە بە موڵكو تاپۆ، لە کۆستەی چەم لە بەکرەجۆ، هونەرمەندێکی وا دیار لە جیاتی بکرێ خەڵات، کەچی بەپێچەوانەوە زەوی خۆی تەرخان دەکات بۆ پرۆژەی گشتیو رۆشنبیریو نەتەوەییو خێرخوازی، بە مەبەستی نەستۆپاکیو سەربەرزیو شانازی، بە پێچەوانەی دزیو گەندەڵی، مێژوویەك تۆمار بکات بۆ خۆیو گەلی. خەمخۆری شارە، بە ئاغا ناودارە، چەوسێنەر نییە خزمەتگوزارە، لە زۆربەی تیپە هونەرییەکانو کۆمەڵەکان ئەندامە، لە ڕاژەو بەرژەوەندی کورددایە بە هونەرو ئەدەبو هەستو دەستو خامە، ئەستێرەیەکی پرشنگدارە لە کەشکۆڵو ساباتو ڕەنگاڵەو بەرنامەی بەرنامە، مرۆڤێکی بەرزو مەزنە، بۆتە یاداشتو خەزنە، شانازی بەوە دەکا بشمرێ هەر زیندووە، چونکە لە ناو دڵی خەڵك دەژیو چەملكو میراتی نەمری بەجێهێشتووە. ئاغا گوڵەباخی گوڵزارێکە، لە جوانی هونەر وەستاکارێکە، لە بواری ئەدەبو نوواندن چ شۆڕەسوارێکە!:

هەر شوێن پێیەکت شوێنەوارێکە

هەر جێ بستێکت یادگارێکە

لە هەڵوێستی جوان قەت دانەبڕاوی

سلێمانییەکەم عەجەب شارێکە!

**ڕەهبەر سەید برایم**

**کانونی یەکەمی ٢٠٢٣**

**ساڵنامەی شەوی بەرات، ژمارە (١)ی ٢٠٢٢/٣/١٨..**

# ئاغای شار.

**لەجیاتی نقوڵو خورما قەڵەمو دەفتەر دەکات بە دیاری بەرات..**

**سازدانی: بەیان محەمەد**

شەوی بەرات لای هەر تاکێکی شاری سلێمانی یادگاری تایبەتی خۆی هەیە.. هونەرمەندو کەسایەتی شاری سلێمانی (ئاغا)یش وەکو یەکێك لەو کەسانە سەبارەت بە یادەوەری سەردەمی منداڵی خۆی ئەڵێت: ئەو رۆژگارە زۆر جوانبوو.. چەند رۆژێ پێش هاتنی شەوی بەرات، توورەکەیەکی خامیان بۆ ئەدروروم، دەمەکەی بە دەزووی کشتەك هەڵئەپێچرا.. دوای نانخواردنی ئێوارە چەند منالێکی گەرەك، کە هەموو وەکو براو کەسی یەکتر وابووین، بە ماڵاندا ئەگەڕاین، ئەو کاتە شار بریتیبوو لە چەند گەرەکێك، کە لەیەکەوە زۆر دوور نەبوون. ئەمانتوانی تەواوی ماڵەکانی شار بگەڕێین، کە دەچووینە بەردەمی هەر ماڵێك بە یەکدەنگ ئەمانوت:

**شەوی شەوی بەراتێ**

**خوا دوو کوڕو کچێکتان باتێ**

**خاتوونی سەر بەزێڕێ**

**دەس لە کەندوان بگێڕێ**

**بەشی منالان بنێرێ**

ئەوانیش خورماو نقوڵو هەندی ماڵیش پارەیان ئەدایێ.

* بۆچی لەو شەوەدا بە زۆری خورما دراوە بە منداڵان؟

+ خورما یەکێکە لە شیرینییە پیرۆزەکان، لە بۆنە ئاینییەکاندا پێشکەش کراوە، رەنگە هەر ئەم پیرۆزییە وایکردبێت، کە لە شەوی بەراتیشدا بدرێت بە مناڵان.

* یەکێك لە نەریتە باوەکانی ئەو شەوانە فڕاندنی توورەکەی دەستی منداڵان بوو..؟

+ سەبارەت بەم دیاردەیە ئاغا وتی هەندێ جار مناڵەکان شەڕەنگێزیان تیابوو بۆ رفاندنی توورەکەی یەکتری، بەڵام من زۆر بە جوانی ئاگام لە توورەکەکەمبوو، زۆر بە وریاییەوە ئەمپاراست.

* بەداخەوە هەتاکو ئێستە وەکو پێویست کار لەسەر بۆنەو یادە پیرۆزەکان نەکراوە. شەوی بەراتیش یەکێکە لەوانە، کە رەنگدانەوەی لە پانتایی شانۆو دراما کوردییەکاندا غایبە؟!

+ لەم روانگەیەوە ئاغا ئەڵێت: بەداخەوە خەڵکی بە زۆری بە بۆنەیەکی ئاینییان ئەدایە قەڵەم، کارە شانۆییەکانیش خۆیان بەدوور نەگرت، بۆیە رەنگی نەداوەتەوە.

* کۆمەڵەی کەلەپوور، هەمیشە پێشەنگبووە بۆ زیندووکردنەوەی دابونەریتو بۆنەو یادە پیرۆزەکانی نەتەوەکەمان.. ئەندامەکانی وا راهێناوە، کە بەدوای داهێنانی نوێدا بگەڕێن، کاکە (ئاغا)یش، وەکو ئەندامێکی دڵسۆزو خەمخۆری کۆمەڵە، یەکەم کەسە، کە گۆڕانکاری لە بەخشینی دیاری شەوی بەراتدا کردووە، لەجیاتی نقوڵو خورما (پێنووس)و (دەفتەر) ئەبەخشێت بە منداڵان. سەبارەت بەم کارە پیرۆزو جوانەشی وتی:

+ بێگومان ئەو بیرۆکەیە هی منە، چەندین ساڵە لەبری شیرینیو پارە (پێنووسو دەفتەر) ئەبەخشمە منالەکان.. لەبەر دوو هۆ:

یەکەم: شیرینییەکە دانیان کلۆر ئەکاو زیان بە تەندروستییان ئەگەیەنێت.

دووەم: پارە فێری مادە پەرستییان ئەکا.. بۆیە بەلای خوێندەواریانا رایانئەهێنم، تاکو لە پاشەڕۆژدا کۆمەڵگە کەڵکیان لێببینێت.. هیواخوازم لە ئێستاو دوا بکرێتە نەریتێك.

هونەرمەند (عومەر کەریم سەعید ئاغا)، کە بە (عومەری کەریم ئاغا) ناسراوەو هەندێکیش هەر بە (ئاغا) بانگی دەکەن.. لە رۆژی ١٩٤٤/٧/١ لە گەڕەکی مەڵکەندی سلێمانی لەدایکبووە، لە کۆتایی شەستەکانا ئامادەیی وێژەیی تەواوکردووە.. لە رۆژی ١٩٦٨/١١/٢٣ لە زانکۆی سلێمانی دامەزراوە، تا ئەو کاتەی زانکۆ گواسترایەوە بۆ شاری هەولێر، دواتر لە سەر خواستی خۆی گواستراوەتەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی چاودێری کۆمەڵایەتی.. زیاتر لە نیو سەدەیە لە کاری هونەری شانۆو نواندنا کار ئەکات.

لە بواری نووسینیشدا شەش بەرگی بە ناوی (کوشکۆڵی ئاغا)وە چاپکردووە..

ئێستا خانەنشینو دوکانی بەهاراتی هەیە لە نزیك شارەوانی کۆنی ناو بازاڕدا.. هیوای تەندروستباشی بۆ ئەخوازم..

# هەندێ زانیاری کەسایەتیم

**لەم تیپە هونەرییانەیا ئەندامبووم:**

- تیپی هونەرو ویژەی کوردی.
- تیپی پێشڕەوی شانۆی کوردی.
- تیپی ڕەنگاڵە.
- تیپی شانۆی سالار.
- تیپی شانۆی زانکۆی سلێمانی.
- ئەندامی سەندیکای هونەرمەندانم.
- ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کوردستانم.
- ئەندامی ڕێکخراوی ئاشتی خێرخوازی جیهانیم.
- ئەندامی ڕێکخراوی ئاشتی (بان)م.
- ئەندامی پاراستنی ژینگەو مرۆڤدۆستیم.
- ئەندامی سەندیکای هونەرمەندانی عێراق بووم.
- ئەندامی کۆمەڵەی کەلەپوورم.
- ئەندامی مەڵبەندی ئاشق گشتی جیهانیم، هەڵبژێردرام لە ناو سەد کەسا بۆ ساڵی ٢٠٢٠-٢٠٢١.

خەمخۆری شارەکەمم بە تایبەتی‌و کوردستان بە گشتی..

**هاوڕێو دۆستی ئەم کۆمەڵانەشم:**

* کۆمەڵەی تالاسیمای کوردستان.
* کۆمەڵەی کورتەباڵایان.
* کۆمەڵەی کەمئەندامان.
* کۆمەڵەی نابیستان.
* کۆمەڵەی نابینایان.
* خەڵوەتگەی پیریو خانەی نەوجەواناناو مناڵانی بێ سەرپەرشتیار.
* لە هاوکاری هەندێ لە قوتابخانەو قوتابیانیش پەرۆشیم هەیە.

لە رووی کۆمەڵایەتیشەوە پەیوەندی توندو تۆڵم هەیەو مرۆڤدۆستم، هەموان بە کەسوکاری خۆم ئەزانم، دڵم پێیان خۆشەو هاوخەمیانم.

٢٠٢٢/٨/٨

* * *

لە ژیانما هەرچیم پەیداکردووە، زادەی دەستو بازووی خۆم بووە، سوپاس بۆ خوا منەتی کەسم هەڵنەگرتووە..

لە کۆڕەوی ساڵی ١٩٩١ بەشداریم کردووە.. لە شەڕی براکوژیا ئاوارەی ئێران بووم.. لە (تۆپبارانکردنی قەڵادزێدا بووم، ئەوکات فەرمانبەری زانکۆبووم).. لە ساڵی ١٩٦٤ وازم لە هەموو سیاسەتێك هێناوەو سەر بە کۆمەڵانی خەڵکم.. دەرچووی ئامادەیی، بەشی ویژەییم..



لە ١٩٦٨/١١/٢٣ لە زانکۆی سلێمانی دامەزرام بە هاوکاری کاك کەریم قەرەنی (درووود بۆ گیانی پاکی)، کە ئەوکات موتەسەرڕفی سلێمانی بوو، هاوڕێی خاڵم بوو.. بیستو حەوت ساڵ فەرمانبەریم کردووە لە زانکۆی سلێمانیو بەڕێوەبەرایەتی چاودێری کۆمەڵایەتی، بە پلەی (سەرۆکی تێبینەران).. دواتر خانەنشین بووم.

لە کۆتایی شەستەکانەوە، لە بەرنامەی کەشکۆڵو ساباتو ڕەنگاڵەو بەرنامەی بەرنامەیا بەشداربووم..

ئەو سیڤییەی تۆمارمکردووە لەم کەشکۆڵەیا تەواوکەری زانیارییە لە بارەی کەسایەتیمەوە بە ئامانەتەوە ڕاگەیەنراوە، هیچ جۆرە لاریو بەخۆداهەڵدانی تیا نییە، لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیرییەوە دانی پیانراوە.. بەهیوام پەسەندم بکەن.. لەگەڵ ڕێزما..

٢٠٢٢/٨/١٠



**لەم تەلەفزیۆنانەشا ڕۆڵم دیوە:**

- ✡ تەلەفزیۆنی بەغا.
- ✡ تەلەفزیۆنی کەرکوك.
- ✡ تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان.
- ✡ تەلەفزیۆنی کوردستان.
- ✡ تەلەفزیۆنی ڕووداو
- ✡ تەلەفزیۆنی کوردسات.
- ✡ تەلەفزیۆنی خاك.
- ✡ تەلەفزیۆنی KNN.
- ✡ رادیۆی بەغا، بەشی کوردی..

*** 

شانازی بەوەوە نەکەم، نە مۆڵەتی نیشتەجێی هیچ وڵاتێکم هەیەو نە رەگەزنامەی.. کە خەڵکانێك هەن پۆزی پێوە لێئەدەن..

(مەبەست لە بڕوانامەی "إقامەو جنسیە"ی وڵاتانی هەندەرانە)

٢٠٢٢/٨/٢١

***

ئەندامی کۆمەڵەی نەتەوەیی کوردم، کاتێك کە ئۆباما بووە سەرۆکی ئەمریکا پێشنیارێکمان ئاراستەکرد بە ناوی کۆمەڵەوە بۆ ئاوڕدانەوەیەك لە گەلی کورد، کە وەکو گەلانی جیهان ئاوڕی لێبدرێتەوە.. دەقی بابەتەکەش لەم کەشکۆڵەدایە بە واژۆی ئەندامەکانی..

بەڕێز/ باراك ئۆباما،

بە سڵاوێکی گەرم،

خۆمان بە خۆشحاڵ دەزانین بە ناوی کۆڕی سەربەخۆیی کوردستانەوە پیرۆزباییتان لێبکەین، بەبۆنەی هەڵبژاردنتان بۆ سەرۆکی ئەمریکاو ئەو متمانە زۆرەی کە خەڵکی ئەمریکا پێیان بەخشیون.

بەڕێز/ جەنابی سەرۆك،

ئێمەی گەلی کورد لە کوردستان، هەر لە سەدەکانی رابردووەوە تا ئازادکردنی عێراق بە سەرکردایەتی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، رووبەڕووی سیاسەتی جینۆسایدو پاکتاوی نەژادیو راگواستنو کاولکاری هاتووین لە لایەن وڵاتە دراوسێکانەوەو دیارە ئێوەش پێئاگانین.. کۆڕەوە سێ ملیۆنییەکەی بەهاری ۱۹۹۱تان دێنینەوە یاد، کە هەموو مرۆڤایەتی هەژاندو نەجوومەنی ئاسایش لێی بێدەنگ نەبوو، بووە هۆی دروستبوونی هێڵی ۳٦، کە ئەمریکا لەو بڕیارەدا رۆڵی کاریگەری هەبوو، تا جارێکیتر رژێمی دیکتاتۆری بەغداد جینۆسایدمان نەکاتەوە. دیارە بەڕێزتان ئاگادارن، کە لە سەرەتای سەدەی بیستەمیشدا کە عێراق دروستکراو باشووری کوردستانی پێوەلکێنرا بە خواستی کورد نەبووە.. بۆیە ئەو پرۆژەی دابەشکردنەی عێراق بۆ سێ هەرێم کە لە لایەن هاوڕێیانی بەڕێزتانەوە خرابووەڕوو، کارێکە بە ئاراستەی بەرژەوەندی کوردو ئەمریکاو بەدیموکراتیکردنی جیهانیش.. ئێوەی

بەڕێزیش دەتوانن بەرەو بەو هاوپەیمانێتییەو دۆستایەتییە بدەن، کە لە بەرژەوەندی هەردولادابێت.

بەڵام تا ئێستا سیاسەتی ئەمریکا بەرامبەر بە گەلەکەمان زۆر روون نابینین، زۆر لە کێشەکانمان بە هەڵواسراوی ماونەتەوەو وای دەبینین، لەگەڵ هەر کشانەوەیەك لە عێراقدا گەلەکۆمەکێیەکی چەند لایەنە بکرێتە سەر هەرێمی کوردستانو ئەزموونە دیموکراسییەکەمان تێکبدەن، گەلەکەشمان جارێکیتر بەر شالاوی راگواستنو جینۆساید بکەوێتەوە.

بەڕێز جەنابی سەرۆك،

ئاوڕدانەوەتان لە کێشەی کورد چارەسەرێکی بنەڕەتیو دروستکردنی کیانێکی سەربەخۆی کوردی بێگومان پاڵپشتی زیاتر لە ٥ ملیۆن کورد بۆ خۆتان مسۆگەرتر دەکەن، لەم روانگەیەوە چاوەڕوانی هیممەتتان دەبین تا ئازادیو دیموکراسی جێی توندوتیژیو کاولکاری بگرێتەوە..

هەر سەرکەوتووبن..

**کۆڕی سەربەخۆیی کوردستان**

**٢٠٠٨/١١/١٢**

**ئەندامانی کۆڕی سەربەخۆیی کوردستان:**

١- دکتۆر ئیحسان فوئاد
٢- دکتۆر محەمەد مەحوی.
٣- دکتۆر هۆگر بەرزنجی
٤- بەهادین نوری غەفور
٥- شێخ سدیق شێخ مەحمود
٦- جەمال عومەر مێوژە
٧- عبدالقادر شکاك
٨- عوسمان عەبدولڕەحمان
٩- تۆفیق سەعید قوربانی
١٠- ئاسۆ ئەحمەد
١١- رەئوف ئەحمەد فەتاح
١٢- عومەر کەریم ئاغا

Dear Mr. President (Obama)

On behalf of Kurdistan Independent Congregation, I am so proud to express our deepest congratulation to you for being elected as the president of the United States of American and for that enormous trust the US people have in you.

Dear President, we (the people of Kurdistan) have been through long history genocide and suppression for many centuries ago until the liberation of Iraq by US. As you know, many policies of ethnic cleanliness, displacement, and total alienation by different neighboring countries including Iraq as well, have been conducted against Kurds. Allow me to remind your Excellency the mass flee of Kurds in 1991, when three million Kurds flee to the mountains, the thing which touched the whole world, and the very reason which made Security Council to establish the non-fly zone 36 to protect the Kurds. It was a great step in which US had the major role. I would also like to remind you that in the beginning of the twentieth century, when the southern part of Kurdistan was merged with Iraq, the Kurdish people stood against this decision. that is why we consider the project of dividing Iraq on three regions presented by your co-allies as serving the interests of both the American and the Kurdish nations and a further step towards world democratization and towards strengthening the alliance between our nations.

Unfortunately, the strategic policy of the United States towards our nation is not clear-cut and obvious. many of our problems are still unresolved... and we assume that any retreat from Iraq will result in threats on the Kurdish nation and its democratic experience and the same policies of ethnic cleansing and genocide would be repeated again.

Mr. President.

Your support and consideration of our problems will guarantee the support of more than 50 million Kurds. We are looking forward to your efforts

12-11-2008.



# ڕوونکردنەوە

سەعات یازدەی ڕۆژی ٢٠١٣/١١/١٠، لیژنەیەکی تایبەت لە شارەزایانو پسپۆران، لەسەر داوای بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری سلێمانی کۆبووەوە، بۆ یەکلاییکردنەوەی مەسەلەی دیاریکردنی ڕۆژێك بۆ یادی سلێمانی. ئەندامانی لیژنە تاووتوێی هەموو لایەنێکی ئەم بابەتەیان کردو ڕاستییەکانی مێژووی شیکردەوەو هەڵسەنگاند. سەرەنجام ئەوەیان پەسەندکرد کە ئەو ڕۆژی ١١/١٤یە کە گوایە سلێمانی تێدا دامەزراوەو چەند ساڵێکە ئەو یادەی تێدا دەکرێتەوە، هیچ بنچینەیەکی مێژوویی نییەو تەنیا ئەوە زانراوە کە سلێمانی ساڵی ١٧٨٤ دامەزراوە. بۆیە لیژنە پێشنیاریکردو هاودەنگبوو کە لەمەودوا ئەو یادە بە ناوی (ڕۆژی سلێمانی)یەوە بکرێتەوە، نەك (یادی دامەزراندنی سلێمانی). هاوکات پێشنیاریشیکرد (٣٠ی نیسان)ی هەموو ساڵێك بۆ (ڕۆژی سلێمانی) دیاری بکرێت.

جگە لەوە، لیژنە ئەم پێشنیارانەیش بۆ سەرخستنی ئەم پرۆژەیە دەخاتە بەرچاو:

١- پێکهێنانی لیژنەیەکی باڵا لە ئاستی پارێزگای سلێمانیدا لە نوێنەرانی بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری، زانکۆی سلێمانی، پەروەردەی سلێمانی، دەزگاکانی ڕۆشنبیری ناحکومی، چینو توێژی جیاجیای شار لە سەرمایەدارو کاسبکارو پیشەوەران. ئەم لیژنەیە جێیەکی تایبەتی لە تەلاری پارێزگادا هەبێو ساڵی چەند جارێك کۆبێتەوە بۆ دانانی

بەرنامەی فراوان بۆ هەردوو بۆنەی (رۆژی سلێمانی)و (نەورۆز). کارێك بکرێ ئەم دوو بۆنەیە بکرێتە کەرنەڤاڵێکی شارستانی فراوان، چالاکیی هەمەجۆری رۆشنبیریو گەشتیاریو کۆمەڵایەتیو کولتووری تێدا بنوێنرێ. ئەم چالاکییانەیش پێویستییان بە بودجەیەکی تایبەتی ساڵانە دەبێ.

٢- ئەم دوو بۆنەیە بکرێتە دەرفەتێك بۆ داوەتو بانگکردنی میوانانێکی زۆر لە ناوەوەو دەرەوەی کوردستان بۆ نیشاندانی جوانییەکانی سلێمانی..

**ئەندامانی لیژنە:**

جەمال بابان ئەکرەمی ساڵحی رەشە محەمەد مەردان

ئیبراهیم ئەحمەد عومەری کەریم ئاغا هۆشیار ئەحمەد

ئەیووب رۆستەم سدیق ساڵح

یەکشەممە ١٠/١١/٢٠١٣

# ئامۆژگارییەکانی باوکم.

بــاوکی رەحمــەتیم ســاڵی ۱۹۰۲ هاتۆتــە ژیانــەوەو ســاڵی ۱۹۵۹ دوامالّئــاوایی لێکــردووین.. واتــە (۵۷) ســاڵ ژیــاوەو ئــەو ئامۆژگاریانــەیم لاماوە.. بەرێزەوە تۆماری ئەکەم، وەك وەفای باوك و فرزەنی..

یــەکێ لــەو کاریگەریانــەی کــە زۆر کــاریتێکردووم، کۆچــیدوایی باوکمبوو، لە کاتی جێبەجێکردنی فەریزەی حەج لە ولاّتی سعودیەو مــەزاری ئاوارەبوو. خۆ ئەگەر مەزارەکــەی لێرەبووایــە لەوانــەبوو لانــی کــەم هەفتانــە سەردانی گۆرەکەیم بکردایەو کێلی مەزاریم ماچکردایە!

لەبەر ئەوەی ئامۆژگارییەکانی لــە ژیانمــا کاریگــەربوون، لــەم خالاّنــەی خوارەوەدا چریان ئەکەمەوە، کە ئەیفەرموو..

- ✳ باوەڕت بەخۆتبێ‌و چاولەدەستی خۆتبە.
- ✳ خاك‌و خەڵکی ولاّتەکەت خۆشبوێ.
- ✳ لە هاورێی خراپ خۆت بپارێزە.
- ✳ چاوت لە ماڵی حەرام نەبێ.
- ✳ هەتا ئەتوانی لە درۆ بەدووربە.
- ✳ کەسایەتی خۆت لەدەست مەدە..
- ✳ هەوڵبە لە ئاستی متمانەی خەڵکیابیت..
- ✳ کە کارت بەدەستبوو بزانە چۆن کار ئەکــەیت‌و تووشــی هەڵــەت نەکەن.

* نەکەی خۆت بە زل بزانی لە ئاست خەڵکیدا، بۆ ئەوەی بەکەم تەماشا نەکرێی.
* کە ماڵتبوو بەخشندەو میهرەبانبە، با میوان رووت تێبکا..
* ماڵو سامان لێی نەبەخشیو نەیتۆشی هیچت بۆ نامێنێ، بۆت نەخۆن.
* چۆن حەیاو شەرەفی خۆت ئەپارێزی واش لە بەرامبەرت بڕوانە.
* ئەجری دراوسێتی گرانە، ڕێزیان لێبگرە..
* لە ڕووگرژیو تووڕەیی خۆت بەدوور بگرە بۆ ئەوەی خۆشەویستبیت.
* پێداویستی ماڵ ئەرکێکی گرانە ئەبێ بەجێی بگەیەنی..
* هەرچی هانای بۆ هێنایو داوای یارمەتی لێکردی، کە باوەڕت پێکرد بەپێی توانات هاوکاری بکە.
* خوێندەواری ڕووناکییە، نەخوێندەواری پێچەوانەکەیەتی.
* هەوڵی فێربوونی زمان بدە بۆ ئەوەی لە زمانی خەڵکی بگەی.
* ئەگەر کەوتیتە باری قەرزارییەوە هەوڵبە خۆتی لێ رزگارکەی بە سوپاسی خاوەن قەرزەوە.
* تا ئەتوانی لە تووڕەبوون خۆت بپارێزە با کاری نەشیاوت لێ روونەدا..
* ڕێزی خۆت زامنە بۆ ڕێزی بەرامبەرەکەت.
* بە خۆشەویستی خەڵك خۆشەویست ئەبی.
* بە کاری خزمەتگوزاریت ئەتوانی ناستی ناو کۆمەڵگات مسۆگەرکەیت.

* هەمیشە لە هەوڵی ئەوەیابە کە تووشی هەڵەنەبیت، ئەگەر خوانەکردە تووشتهات، ئەبێ وانەی لێوەرگری بۆ ئەوەی دووبارەی نەکەیتەوە.
* ماڵو سامانو دەسەڵات کاتییە، پۆزی پێوە لێمەیە..
* خەڵکی وریاو زرنگن، کارێکی وامەکە لە دوای مەرگیشت سەرزەنشت بکرێی.
* نەکەی خۆت بە کەم دابنێی، نەوەك بە کەم تەماشابکرێی.
* هەمیشە لە هەوڵی فێربوونابە، چونکە فێربوون بێکۆتایە.
* هەموو مرۆڤێ کۆتایی بە ژیانی دێت، هەوڵبە بۆ دوای مەرگیش کاری دیارت بەجێهێشتبێ.
* هەر کارێك نەتزانی، خۆتی لێمەکە بە زانا.
* لە ناو خێزانا دەنگی ژنو مێرد یەکبێ، منداڵ جوان پەروەردە دەکرێ.
* هەوڵبە کەسێکی سادەو ساکارو لەخۆبووردەبیت.
* ئاشتیخوازبە، دووربە لە شەڕەنگێزی.

ئەوەی لە بیرم مابێ ئەو چەند خاڵەبوو، بۆیە منیش گەیاندوومەتە ئاستێك کە وەك پێویستی خەڵکی بێت..

هیوادارم ئەو ئامۆژگارییانە خوێنەرانی بەڕێز سوودی لێوەرگرنو ئەوە دوای ئەوە ڕەچاویکەن..

# ڕوونکردنەوەیەك دەربارەی زەوییەکانی بەکرەجۆ.

کەسێك بە ناوی حاجی حەمەخان بازرگانبوو، لە قەیسەری وەسمان پاشا، دۆستایەتییەکی زۆری هەبوو لەگەڵ باوکی ڕەحمەتیم، ئیمەش وەکو وەچەی ئەو ڕێزی زۆری لێدەگرتین.. ڕۆژێك هاتە دوکانەکەم، فەرمووی تۆ وەك برازام وای، زەوییەکمان هەیە لە بەکرەجۆ (١٣,٢٠) سیانزە دۆنم و بیست نۆلکە، لێمبکڕە، بۆ ئێوەبێ باشترە، ئەگەرچی ئێستا بەدەست جوتیارەوەیە، کە ناسیاوی ئێوەن و دانیشتووی کۆستەی چەمن، ڕێزتان لێدەگرن و لەگەڵتان ڕێدەکەون.. وتم بەسەر چاو.. حەق و حسابت چەندە بیخەمە سەر چاوم. ئەوەبوو ڕێکەوتین لە فەرمانگەی تاپۆش واژۆی ڕەزامەندی خۆی کرد، دوایی لەگەڵ جوتیارەکانیش پێکهاتین لەڕێی بەڕێوەبەری ناحیەی بەکرەجۆوە بەپێی نوسراوی فەرمی.. دوا جار وتیان ئیفراز ئەکرێت، ئیفرازکرا لەبری ئەوەی لە سەدا دوانزەم بەنەوە بەپێی بڕیاری ئەنجوومەنی وەزیران، بەڵام لە سەدا دەیان دامەوە (٤٢٩,٣٠) چوار سەدو بیست و نۆ مەترو پۆینت سی کەمیان یامەوە، هەوڵمدا کە بۆم بگێڕنەوە وتیان ناکرێ. وتم باشە هەر نەبێ بکرێ بە پرۆژەیەکی گشتی وەك باخچەی ساوایان، یان (خەستەخانەیەك) ئەوەشیان نەکرد، دواجار لەوەی کە بەریشم کەوت چوار پارچە زەویم بە ڕووبەری (٨١٤) هەشت سەدو چواردە مەتر بۆ ڕۆشنبیری تەرخانکرد، کە بکرێت بە بینایەك بۆ پاراستنی ئەرشیفی نەتەوەیی.. ئەوەشیان نەکرد، بۆیە ئەم بابەتەم

تۆمارکرد.. هەندێ جار لەم لاولا بەر گوێم ئەکەوت کە گوایە لە حکومەت یان فلان حیزب‌و لایەن وەرمگرتبێت.. هیچ ئەسڵ‌و ئەساسی نییە، منەتم بە کەس نییە ئەوەی بە رەنجی شان پەیام ئەکردبێ بە هی خۆمی نازانم. ئەمەش جۆرێکە لە ئەستۆپاکیم‌و شانازی بە ماڵ‌و سامانمەوە ناکەم کە لە خزمەتتانا نەبێ.

بۆ زانیاریتان تکایە..

٢٠٢٢/٣/٢٧



## تێبینی.

باوک‌و دایکم بە هەردوکیان سەدو پەنجا ساڵ ژیاون، باوکم پەنجاو حەوت ساڵ، دایکیشم نەوەدو سێ ساڵ.. بەندەش حەفتاو پێنجم تێپەڕاندووە..

ناوی دایکم: حفصە ئەوڕەحمان سەعید

ناوی باوکم: کەریم سەعید

بەندەش: عومەر کەریم سەعید

واتە: ناوی هەموومان بە (سەعید) کۆتایی هاتووە..

# مردنو پەندەکانی!!

دڵنیام بە کۆچی دوایم، یاماڵئاواییم لە ژیان، خەڵکانێکی زۆر خەمم بۆ ئەخۆن، سوپاسیان ئەکەم، داواکارم لێیان سەیری یادگارییەکانم بکەن، بۆ دڵنەواییان.. ٢٠٢٢/٩/١

دڵنیام دوای مەرگم پشکنینم بۆ ئەکرێ،
هیوادارم جێگە بگرێ، مافی خۆمم پێبدرێ...

٢٠٢١/١/٢١

خۆزگە دوای مەرگم بمتوانیایەو بمزانیایە کە چۆن گوزارشت لە پێناسەکردنم ئەکرێ.. ئەوەش مەحاڵە.. ٢٠٢١/٥/٢٥

- ٢٠٢٠/٦/٢٢، کاتژمێر (٤:٣٠)ی سەر لە بەیانی هونەرمەند عەتا چاوشین بە نەخۆشی کۆرۆنا دوا ماڵئاوایی لێکردین، کۆستێکی گەورەو گرانبوو..
- ٢٠٢٠/٧/١٠یش هونەرمەند سابیر کوردوستانی کۆچی دوایکرد، جێگەی خەمو پەژارەمانبوو..

بەهۆی ڤایرۆسی کۆرۆناوە فەیسبوك بووە بە فەیس فاتحە بۆ کۆچکردووەکانو دوعای خێریش بۆ نەخۆشەکان..

کەسێکم زۆر باش ئەناسی، هەواڵیان لێپرسیم کە چۆن پیاوێکە؟ وتم یەکێکە لەوانەی کە کۆچی دوایکرد، خەمی بۆ ناخۆیت!!

## پەیامێك..

## لە کۆچکردووانەوە بۆ زیندووەکان...

سڵاوو ڕێزو حورمەتتان پێڕادەگەیەنین، تەندروستیو تەمەندرێژیو سەرفرازیتان بۆ ئەخوازین.. بەهیوایین ئێوەی زیندوو وەك ئێمە کۆكو تەبابن، یەکڕەنگو یەکدەنگو یەکسەنگبن، وەك ئێمەی کۆچکردووان، کە هیچ جۆرە جیاوازییەکمان نییە، یەکسانیو لێبوردەیی لای ئێمەیە.. دوور لە جیاوازی بیروباوەڕو ئاینو ڕەگەزو ڕەچەڵەك.. هەموان لەژێر سایەی چەترێکی یاساییین، کە پارێزراوین.. داواکارین لێتان لە مردن نەترسن.. ئێوەی بەڕێزیش تەشریف نەهێنن بۆ لای ئێمەو بە سنگی فراوانەوە پێشوازیتان لێنەکەین.. داواشتان لێنەکەین لەسەر ئێمە لە یەکتری زویرنەبن.. تەنها کردەوەی چاکمان لە ئێوە ئەوێت، بەتەنگ یەکەوەبن..

لێرە هەمووی وەك یەکین، دەوڵەمەندیو هەژاریو دەسەڵاتداریو بێدەسەڵاتی نییە.. لەژێر سایەی یاسایەکاین، مافی کەس پێشێل نەکراوەو ناکرێ.. هیوادارین ئێوەش یاسا سەروەرکەن بۆ ئەو ژیانە کاتییەی خۆتان، خراپە نەکەنو یەکتر نەڕەنجێنن، وەك پێویست ژیان بەڕێکەنو خوێندنەوەش بکەنە نەریت بۆ ئەوەی زیاتر لە ژیان بگەن..

## ئێبینی..

ناشیرینترین خوو لە مرۆڤدا درۆیە، تکایە وەلاوەی بنێن.. بەهۆی کۆچکردنتان بۆ لای ئێمە پێویست ناکات پرسەدانێن، بەڵکو سوپاسی

پەروەردگاربکەن کە لە دەردوبەلاو مەینەتی ژیانی ئەو دنیایەتان رزگارتان بووەو ژیانێکی ئاسوودەو ئارامی هەمیشەیی پێبەخشیون.. بۆیە تکاکارین مەبنە مایەی ئەرکو ماندووبوونی یەکتری، کە هیچ جێگەیەك ناگرێو خۆتان نەرەنجێنن.. تەنها شاردنەوەی تەرمەکان لە ئەستۆتانایەو لای ئێمەش وەك خۆمان پارێزراونەبن.. هیچ دڵتان لایان نەبێت.. ئیتر هەر کارێکی دیکە بکەن نەکەوێتە ئەرکو ماندووبوونەوەو زیاد تێچوون.. لەڕووی ئاینیشەوە نە واجبەو نە سوننەت.. بەڵکو بۆتە نەریتێك کە لە جێی خۆیدا نییە، رووگیریو ریاییە!!

هەر لە رووی تێبینییەوە، جاری وا هەبووە خەڵکانێك لە دوورەوە هاتوون بۆ پرسە، لە رێگا تووشی رووداوی نەخوازراو بوون، پرسە بووە بە دووان، بە سیان، جگە لەوەش لە ناو شارەکەشا رۆژانە چەند پرسەیەك هەیە کە فریایان ناکەوی.. ئەبێت بە تەکسی بڕۆیت، ئەوەش بارگرانی زیاتر دروست ئەکات، کە لە توانای هەندێکا نییە.. وە بە پەیوەندییەکی تەلەفۆنی ئەتوانرێ کارەکە مەیسەر بکرێ.

لەگەڵ رێزی کۆمەڵەی کۆچکردووان

**پەیامنێری ئاخرزەمان**

عومەر ئاغا

٢٠٢٢/٨/٢٦

# ئەوەی تێیگەیشتم

❊ هیچ کاتێك کورد داگیرکەر نەبووەو هەڵنەکوتاوەتە سەر خاكو ماڵی کەس..

❊ ئەوەی وێنەم لەگەڵ ئەگرێ، بە کەسوکاری خۆمی ئەزانم..

❊ لە نەخۆشییەکەما بۆم دەرکەوت، کە خەڵکی چەند خۆشیان ئەوێم!! جوانترین سوپاسو رێزم هەیە بۆیان...

❊ سەردانی هەر شوێنێکت کرد، شتێك لە بارەی شوێنەکەوە بزانە..

❊ بۆ فێربوونی زمان، هەوڵت هەمیشەییێ..

❊ زرنگی مرۆڤ لەوەدایە، هەمیشە لە هەوڵی فێربووناییێ..

❊ هەر وڵاتێکی کشتوکاڵی، جوتیارەکانی تەمەڵبن، بێبەرهەم ئەبن..

❊ هەواڵی هەر کەسێك ئەپرسی، یا نەماوە، یا داماوە!!

❊ سێ جۆر چەك کوردی لەناوبردووە:

١) سیاسەتی هەڵەو بەزۆر سەپاندنی..

٢) چەکی پارەو هەڵخەڵەتاندنی..

٣) چەکی دووبەرەکیو بێهێزکردنی...

❊ هەموو جۆرە ئازاردانێکم پێناخۆشە، ئەگەر لە باخچەی ئاژەڵانیشدابێ، هەروەها ئەو وەرزشانەشی وەك بۆکسێنو زۆرانبازیو هەموو ئازاربەخشەکانیتر بە گشتی..

❊ هەر چوارینەیەك دائەبەزێنم بە دۆستایەتیو خۆشەویستیو ڕێزی ئەو خەڵکە، بە کۆمێنتە جوانو سەرنجڕاکێشەکانیان کەشکۆڵێکی لێ بەرهەمدێت، سوپاسو پێزانینم بۆیان..

❊ هەموو وڵاتێك دەردیسەری خۆی هەیە، گرنگ ئەوەیە مرۆڤەکانیو دەسەڵاتدارانی بتوانن چارەسەری بکەن...

❊ هیچ کاتێك بێ میوان نەبووم، لەبەر ئەوەی کتێب میوانمە، یان میوانی کتێبم..

❊ بەداخەوە لە شاری رۆشنبیریا کتێب (فرۆشی) نییە!!

❊ شکسپیر فەرموویەتی گەورەترین نیعمەتی ژیان ئارامی دەروونە، ئەگەر هەستی پێبکەی هەموو شتێك هی تۆیە!!

❊ جێی داخە ئێمەی کورد هەر باسی مێژووی خۆمان ئەکەینو کاتێکیش هۆکاری شکستەکانمان ئەخەینەڕوو، وانەی لێوەرناگرین.. ئەو پەندەمان رەچاو نەکردووە کە ئەڵێ سوار تا نەگلێ نابێ بە سوار!.. لەوەتەی هەین هەر گلاوین!!..

❊ جۆرەکانی هاوڕێ: هاوڕێی منداڵی، قوتابخانە، گەڕەك، خەستەخانە، گرتووخانە، سەفەر، لێقەومان، سفرەوخوان، بەرژەوەندی، ژیان!!

❊ ئەگەر دەستگیرۆیی لە هیچا نەکەی، نەبێ لە ناوو کارەبایا بیکەی..

❊ نەشێ مرۆڤ بتوانێ لە شوێنێکی شیاوا، بە رستەیەکی شیاو، مێژوویەکی شیاو بۆ خۆی دەستەبەربکات.. بە پێچەوانەشەوە بە رستەیەکی نەشیاو کەسایەتی خۆی لەدەست بدات..

# گوزارشت لەماناى ژیان

بــە بۆچــوونی خــۆم‌و ئاســتی تێگەیــشتنم بــەهۆی تەمــەن‌و پەیوەنــدی کۆمەڵایەتیم، ئەتوانم لەم چەند خاڵــەی خوارەوەیــا کــۆی بکەمــەوە، بــەهیوام سوودی هەبێ..

١- ژیان ئەزموونێکە بۆ هەڵسەنگاندنی مرۆڤەکان.

٢- ژیان ئەو دەرفەتەیە کە مرۆڤ بتوانێ سوودبەخشبێ‌و ئاستێکی باشی کەسایەتی تیا دەستەبەربکات..

٣- ژیان جۆرێکە لە کوێرەوەری‌و دەردیسەری..

٤- ژیان بەهەشتی کاڵفامەکانەو دۆزەخی زۆرفامەکانە..

٥- ژیان پێپێنەکەنی، پێتپێنەکەنێ..

٦- ژیان سینەمای خوایە.

٧- ژیان بێشەیەکی پڕ کێشەیە..

٨- ژیان یەکسانی تیا بەدیناکرێ..

٩- ژیان لە هیچەوە دەستپێنەکاو بە هیچیش کۆتایی دێت.

١٠- ژیان ئەسپێکە نەیزانی غاری پێبکەی ئەتگلێنێ..

١١- ژیان دەریایەکە نەبێ تیا مەلەوانبی..

١٢- ژیان هیلاکی نەکەیت هیلاکت نەکا..

١٣- ژیان زیاتر بێعارو زۆردار لەبەری ئەخوا..

١٤- ژیان وەکو خەوێك وایە، هەیە بە درێژی ئەیبینێ، هەیشە بە کورتی.

١٥- ژیان، مرۆڤ چەند خۆڕاگرو باوەڕبەخۆبێ‌و پەیوەندی کۆمەڵایەتیشی بەهێزو پتەوبێ، زیاتر تیا سەرکەوتوو ئەبێ.

١٦- شەڕێکی بەردەوامە..

ئەو چەند خاڵە بیروبۆچوونی خۆمە، مرۆڤیش ئازادو سەرپشکە لە دەربڕینی هەر بیرو بۆچوونێکی..

٢٠٢٢/١١/٥

ئـازیزانو خۆشەویـستان، بـەڕێزان، خوێنـەرو پەرۆشـی کەشکۆڵەکانم، بە هیوام میوانداری ئەمجارەمان بـە ڕۆحـسووکی بێتو کارێکی وام کردبێ کە بە قوتابییـەکی زرنـگو زیرەکـی ژیانم پەسـەندکەن، هـیچ کـارێکیش بـێ کـەموکووڕی نابێـت.. ڕەزامەندی ئێوە کەلێنەکانم بۆ پڕ ئەکاتـەوە، ئـەوەی لـە هێـزو هـزرو توانامـدابووبێو تێگەیـشتنی ژیانمـێ، کـە ڕۆژانـە هەڵمسـەنگاندبێ بیرو بۆچوونمە، بـەهیوام لـە ئاسـتی پەسـەندی ئێوەدابم، کە مەبەسـتمە بـە داوای لێبوردنـەوە، ئەگـەر مـەرگ مەودابدات لە بەردەوامیو پەرۆشیمدا ئەبمو خوێندنـەوەی ئێـوە سەرکەوتنی کارمە..

بەهیوای تەندروستیو تەمەندرێـژیو ژیـانێکی ئاسـوودەو ئارام بۆ هەموو تاکێکی خوێنەری کورد..

خۆشگوزەرانیتان ئاواتمە.. لەگەڵ ڕێزما..ماڵتان ئاوابێ...

٢٠٢٢/٨/١٩

لە تافی لاویدابووم، گەنجی تەنگی پێهەڵچنیم، دڵــم بــە قەدری ناوێکەوەبوو، بەڵام داخەکەم بە نــسیب نــەبوو، زانــیم شویکردووە بــە کەســێکیتر.. ســکاڵام لای هەنــدێ دۆســتانم کردبوو، یەکێ لەوانە پێی ڕاگەیاندم کە مێردەکەی هیلاکــەو لەوانەیە بمرێ، وتم جا تــازە بەچــی ئەچــێ؟! وا نزیکــەی پــەنجا ساڵێ بەسەرچوو، بەڵام وەك داخێکی دڵ و هەســتێکی گــەنجی ئەم چوارینەیەم کردە سکاڵا:

مێردەکەی بمرێ قەدری هی خۆمە
قەدری هەنجیــرە هی هۆمەرقۆمە
عــالــەمــێ هــەڵــســێ من بکــا لۆمــە
هەر ئەبێ بڵێــم قەدری هی خۆمــە

٢٠٢٠/١٠/١

دوای ئەوەی کە نائومێدبووم لەوەی، ئەو زەویانەی کە ئەمبەخشی بە رۆشنبیری سلێمانی بۆ دروستکردنی شوێنێکی تایبەت بۆ پاراستنی ئەرشیفی نەتەوەییمان، کە تا ئێستا نیمانە، بۆیە وای بە باش ئەزانم خانووەکەی بەکرەجۆم وەکو مۆزەخانەیەك لێبکەم بۆ ئەو مەبەستە..

کە ئەرشیفی هونەرمەندانو ئەدیبانو بەندەشی تیا پارێزری، بە شێوەیەك برازێنرێتەوە، کە خەڵکی لە هەموو شوێنەکانەوە سەردانی بکەن، ئەگەر سوودی مادیشی هەبێ بۆ بەشە پێداویستییەکانی سەرفبکرێت..

تەنها ژوورێکیشی تەرخان بکرێت بۆ پاراستنی ئەرشیفی کەسێتیو بەرهەمەکانم.. بە باشی ئەزانمو منەتم بە حکومەت نیە، کە ئەبوایە ئەو خزمەتگوزاییانەی بۆ دابین بکردینایە..

داواکارم بە هیچ شێوەیەك بیر لە فرۆشتنی نەکرێتەوە، (وەقف)ی لەسەربێو بپارێزرێ وەك کەسایەتیو هیلاکیو ماندووبوونم، کە لە زۆربەی وڵاتان شوێنەواری لەو جۆرە هەن..

# «یەحیافەنی»

گومانی تێدا نییە مرۆڤەکان کە دێنە ژیانەوە هەریەکە جێگەو پێگەو جۆرە رەفتارو ئاستەنگی خۆی هەیە، بەوە هەڵسەنگاندنی بۆ ئەکرێ، هەموو کۆمەڵگایەکیش خەسڵەتو تایبەتمەندی خۆی هەیە بەهۆی کردارو رەفتارو هەڵسوکەوتی مرۆڤەکانیەوە، کۆمەڵگەی ئێمەش خاڵی نییە لەو مرۆڤانە. ئەشێ لە ناو کۆمەڵێ درکا گوڵێ بپشکوێ، یان لە ناو کۆمەڵێ گوڵا یەکێکیان لەوانیتر سەرنجڕاکێشتربێ، یان لە ناو هەندێ درەختی بەردارا یەکیان لەوانیتر بەرووبوومی باشتربێو .... هتد..

ئەوەی لێرەیا مەبەستە کەسایەتی کەسێکە کە لەوانیتر جیاوازە، بە هەڵسوکەوتو رەفتاریا، هەتا بە جلوبەرگو کرداریشیا.. ئەویش (یەحیافەنی) رەسامو هونەرمەندی شێوەکارە، کە بە دەستو پەنجەی رەنگینی وێنەی ئەنەخشان.. ئەیتوانی وێنەی هەر شتێ وە یا هەر کەسێ بیەوێ بیکات.. جگە لەوەش بەهۆی ئامێرێکی وێنەگرتنی سەرەتاییەوە کە بریتیبوو لە سێپادارێکی بەرزو سندووقێکی لەسەربوو بە سندووقەکەشەوە قوماشێکی ئەستوور، کە رووناکی لێوە دیارنەبوو، لە ناو سندووقەکەشدا قاپێکی تیابوو جۆرە شلەمەنییەکی تیابوو. پێشی سندووقەکەش (عەدەسەیەکی کامێرا)بوو، بە جووڵەی لابردنی قەباغەکەو بە داخستنو کردنەوەی وێنەکەی ئەدا بەدەستەوە، چەند خولەکێکی پێئەچوو، بەو کەسەی ئەوت کە وێنەکەی بۆ ئەگیرا، تەماشای ئەم عەدەسەیە بکە..

ئەم یەحیافەنییە هەڵسوکەوتو جلوبەرگی وەك مرۆڤەکانیتر نەبوو، شازو دیاربوو، شێوەیەکی بیبانی تیابوو، هەندی جار کە ئەرۆیشتە بازاڕ، سەگێکی بەدواوەبوو، لە هاتووچۆی ماڵو بازاڕدا. جاری واش هەبوو سەگەکەی هەندێ کاری بۆ ئەکرد، وەك یارمەتیدەرێکی، کە ئەو کات بە کارێکی دەگمەن ئەدرایە قەڵەم..

من وەکو بیستبووم چەندین زمانی بیانی زانیوە وەك فارسیو ئینگلیزیو تورکیو عەرەبیش، سەری لە ئەڵمانیش دەرئەچوو.

کاتێ کە ئەو وێنەی ئەگرت، خەڵکی ئەیانوت وێنەگرتن (حەرامە!)، تا وایلێهات بوو بە کارێکی ئاسایی.

ئەم پیاوە بووە مامۆستای وێنەگرەکان، هەندێکی کە لە رێی شاگردی ئەوەوە فێری وێنەگرتن بوون، وە بووە کارێکی بەربلاو لەو سەردەمەیا..

یەکەم کەسێ کە وێنەی باوکی رەحمەتیمی گرتووە یەحیافەنی بووەو ئەو وێنەیەشمان گەورەکردووەو ماوە..

ئەم پیاوە کەسێکی لەسەرخۆ، دوور لە تووڕەبوونو هەڵچوون، هێمنو وردبین، ئازاری کەسی نەداوە. هێندەی من بزانم سێ خێزانی پێکەوەناوەو چەند منداڵێکی هەیە لە کوڕو کچ.. کچێکیشی هەڵگرتۆتەوەو کردویتی بە کچی خۆیو هەموو مافێکی باوکایەتی پێبەخشیوە..

لەڕووی بژێوی ژیانیشەوە، کەسێکی ئاساییو بەقەناعەتبوو، تەنها بەشی پێداویستی خۆی بۆ پەیا ئەکراو لێیزیاد نەبوو.. شێخ رەئوف شێخ جەمیل کتێبێکی بە ناوی (یەحیافەنی)یەوە ئامادەو بەرهەمهێناوە، جێی دەستخۆشییە..

به نیسبەتی بەندەوە لەگەڵ سەگەکەیدا یادەوەرییەکی تاڵم هەیە، کە بووە هۆی ئامۆژگاریم، لە کتێبەکەیدا بڵاوکراوەتەوە، ئێستاش دووبارەی ناکەمەوە، لاپەڕە (٦).

دوکانەکەی نزیك بەردەرکی سەرای سلێمانی بوو.. ماڵەکەشی لە گەڕەکی شێخان بوو لە حەوشێکی گەورەیا، کە چەند ماڵێکی دیکەی تیابوو بە هەمووی ئەوترا خانی یەحیافەنی (نزیك ئیمێرجنسی) ئێستا..

وشەی خان بۆ زۆر شت، هەتا بۆ کەسایەتیش بەکار ئەهات، وەکو بازاڕ، خانی ابراهیم ئاغاو حاجی ئەحمەدی کەریم ئاغاو .... هتد.. وەکو کەسایەتیش حەمەڕەشید خانو برایم خانو حەمە خانو .... هتد.. هەندێ جاریش لەڕووی پاراستنی ئاژەڵانی وەك گوێدرێژو ئەسپو وڵاخ بە گشتی، کە شەو تیایدا ئەمانەوە ئەوترا خانی وڵاخ، سەرپەرشتیارەکەشی پێئەوترا (خانچی).

هەر لەبارەی خانەوە، جگە لەوەی باسم لێوەکردووە، لە هەندێ شوێن دروستکراوەو بۆتە مەڵبەندی بازرگانی لە نێوان شارەکانو وڵاتانی دەوروبەر.. ئەم جۆرە خانانەش پانتاییەکی زۆری لە زەوی داگیرکردووە، پێکهاتەکەشی لە چەندین ژوورو تاقو قەیسەریو میوانخانەو چێشتخانەو پێداویستییەکانی تیا دەستەبەرکراوە بە پێی پێگەی بازرگانی سەردەمو مانەوەی بازرگانان کە لەوێ سەرەوتیان یاوەو حەواونەتەوە.. ئەوەش بۆتە مایەی پەیوەندی توندو تۆڵو بووژاندنەوەی بازرگانیو ژیانی خەڵکیش بە گشتیو بازارگەرمیو بەرهەمهێنان..

لێرەیا نەتوانم ئاماژە بە چەند خانێك بدەم بە گوێرەی شوێنەکانیان، وەکو خانی گەورەی کۆیە، کە لەلایەن مەحمود ئاغای غەفوری دروستکراوەو ماوەی سێ ساڵی خایاندووە تا تەواوبووە لە ساڵانی هەشتسەدەکانا.. هەروەها خانی شاری کفریش یەکێك بووە لە مەڵبەندە بازرگانییەکان، کە لە ئێستادا نەتوانین بڵێین بوونەتە شوێنەواری دێرین، ئەگەر بایەخیان پێبدرێ.. کاروانسەرایش لەو نموونانەن...

**یادەوەری منداڵیمو سەگەکەی یەحیافەنی...**

یەحیافەنی سەگێکی هەبوو رەنگ قاوەیی، بەناوی (قەستۆر)، هەمیشە یارمەتیدەربوو، زۆربەی جار لە ماڵەوە بۆ دوکانو بە پێچەوانەشەوە لە دوکانەوە بۆ ماڵەوە شتومەکی لە مل ئەکراو نەیگەیاندە شوێنی خۆی.. زۆربەی هاتوچۆشیان بەو کۆڵانەیابوو کە ئێمەی منداڵ یاریمان تیا ئەکرد..

رۆژێك سەگەکەی تەنهابوو، منیش وەك منداڵێکی کاڵفام ئازارمداو راومنا، ئەویش لای یەحیافەنی شکاتی لێکردمو پێکەوە هاتن.. چەند منداڵێك بووین.. بە ئاماژە بە سەگەکەی وت کامەیانبوو؟ یەکسەر هاتە بەردەمم، بە هێمنی پێوتم کوڕەکەم ئەم سەگەی من هیچ گوناحێکی نییە بۆ عەزیەتت یاوە؟! منیش زۆر شەرمەزاربووم، داوای لێبوردنم لە خۆیو سەگەکەشی کرد.. لێم خۆشبوون، یەحیافەنیش ئەم ئامۆژگارییەی کردمو رووی کردە هەمووان، وتی منداڵینە کارێکی وا مەکەن کە گەورەبوون لێی پەشیمان ببنەوەو ئازاری گیانلەبەران مەیەن..

لەوساوە ئامۆژگارییەکەیم رەچاوکردووە..		٢٠٢٠/١٠/٦

وێنە نیوەی بینینە
وێنە شایەی شینە
وێنە بەڵگەو مێژووە
وێنە کاری لە ڕووە

هەر لەسەر بابەتی وێنەگرتنەوە بەدواداچوونم کرد لەسەر کەسانێك خۆیان وێنەگرن و لە ژیانا ماون.. ئەڵێن کە یەکەم وێنەگر کابرایەکی (ئەرمەنی) یان (جوولەکە)بووە، ناوەکەیم دەستنەکەوتووە، لە دوای ئەو مەحموودەفەنی لە سەفەربەلکا لە سوپای عوسمانیا ئەفسەربووەو کاری وێنەگرتن لەوێوە فێربووە، کە هاتۆتەوە لە سلێمانی دوکانی وێنەگرتنی داناوە.. منیش بۆ ئەوەی زیاتر بچمە قووڵایی بابەتەکەوە پەیوەندیم چڕکردەوەو وەك وەفایەك بۆ وێنەگرانی شارەکەم لە خوارەوە ناوەکانیان تۆمار ئەکەمو هەندێ جۆری کامێراکانیشیان کە تاکو ئێستا هەر کاری پێئەکرێ، بۆ زانیاری خوێنەری بەڕێزو هەوادارانی وێنەو وێنەگران..

**لیستی ناوی وێنەگرە دێرینەکانی شاری سلێمانی:**

سەرچاوەی ئەم بابەتە، کە خۆم شتێکم لە بارەیەوە هەڵکرانبوو، بەڵام بۆ زانیاری زیاتر، ئەم دوو بەڕێزە بە سوپاسەوە هاوکارییان کردم:

* قادر محەمەد شەریف – وێنەگری قادر.
* جەمال سالح محەمەد – وێنەگری هەڵۆ (سەرۆکی کۆمەڵەی وێنەگران)

| ز | ناوی سیانی | ناوی ستۆدیۆ | ز | ناوی سیانی | ناوی ستۆدیۆ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | وێنەگرە جوولەکەکە | – | ١٦ | عومەر محەمەد | عومەر |
| ٢ | مەحموودەفەنی | – | ١٧ | حەمە شوان | شوان |
| ٣ | یەحیافەنی | – | ١٨ | رەفیق مەحمود | رەفیق |
| ٤ | مستەفا سەعید | مستەفا | ١٩ | رەئوف حمە سەعید | رەئوف |
| ٥ | نوری شێخ فەرەج | نوری | ٢٠ | عەلی مەلا ئەحمەد | – |
| ٦ | ئەحمەد دەنگ گەورە | جوان | ٢١ | دلێر حەمە ساڵح | دلێر |
| ٧ | قادر محەمەد شەریف | قادر | ٢٢ | محەمەد زیاد ئیبراهیم | زیاد |
| ٨ | محەمەد ئەمین قادر | ڤیان | ٢٣ | جەزا محەمەد سەعید | جەزا |
| ٩ | محەمەد مام ساڵح | سیروان | ٢٤ | جەمال ساڵح محەمەد | هەڵۆ |
| ١٠ | حەمەنوری حەمەساڵح | هونەر | ٢٥ | حمە ساڵح قادر | سلێمانی |
| ١١ | سەعید قادر | سەعید | ٢٦ | حەبیب فەرەج محەمەد | حەبیب |
| ١٢ | هاشم صادق | ئەمەل | ٢٧ | ساڵح مەعروف سەعید | سەیران |
| ١٣ | حەمە چاورەش | ئاوێسەر | ٢٨ | عوسمان محەمەد | یادگار |
| ١٤ | فەتحی رەشید عبداللە | فەتحی | ٢٩ | عومەر سۆفی عەلی | عومەر |
| ١٥ | بابەعەلی سەعید | گۆیژە | ٣٠ | فایەق | ئاسۆ |
|  |  |  | ٣١ | ئەنوەر | ئەنوەر |

جۆری ئەو کامێرانەی بەکارهاتوون لە کۆنا:

١- کۆداك - ئەڵمانی

٢- ئەگفا - ئەڵمانی

٣- زینییت - رووسی

٤- کیف - رووسی

٥- بۆکس

٦- کامێرای شەمسی

جۆری تازەکان:

١- یوشیکا

٢- ریتینا

٣- رۆل فلیکس

٤- ماميا

٥- تیکۆن

٦- کانون

٧- ئۆلمپس

٨- مینۆڵتا

٩- لومیکس

١٠- سۆنی

١١- چانون

١٢- کونیکا

١٣- ئەدۆکس

١٤- ریکۆ

١٥- سامسۆن

٦٠- تۆماتۆ

وەکــو یــادو پێداویــستی ریــز لەگــەڵ ئــەم گۆرانیبێــژو هونەرمەندانە، کە لە ژیانما بە دیداریان شادبووم، رێزو پەرۆشــی زۆرم هەیــە بۆیــان، هەنــدێکیان کۆچــی دواییــان کــردووەو هەندێکیشان لــە ژیانــا مــاون، کــە بــریتین لــە ئــەم بەرێزانــەی خوارەوە:

کەریم کابان، حەمە ساڵح دیلان، ابراهیم محەمەد، حەمــە جەزا، حەمەی نێرگز، عوسمــان عــەلی، بلــەی ســەعەکەر، عــەتا چاوشین، نەجمەدینی غوڵامی، ناسری رەزازی، مەرزیــە فــەریقی، سەلاح مەجید، تایەری خەلیلی، میدیا حسێن، کــەمال محەمــەد، کامەران عومەر، مەحمود محەمەد، ئەحمەد شەماڵ، بورهان محەمەد، فوئاد ئەحمەد، عەبدولقادر حەسەن، ئیــسماعیل محەمــەد، کــەریم گوڵانی، عەلی یارە، ئیساعیل سابووری، پێشەنگ غەفوور، ئازاد مەحمود شلك، سابیر کوردستانی، ساڵح چایچی، محەمەد دانش، یونس براقی، عەبدوڵای ماملێ، شوکر خەیات، میکایل زاهیر جەلال، کەمال فەدەوی‌و و هەندێکیتریش کە ناویانم لەیاد نەماوە بە داوای لێبوردنەوە..

# ڕوونکردنەوەیەک.

خۆشەویستان، خوێنەرانی کەشکۆڵەکەم، ڕێگە بفەرموون کە ئەم ڕوونکردنەوەیە بخەمە بەر دیدو ڕۆشناییتان، کە هەندێ لە بابەتەکان ڕووداوی ڕۆژانەی ژیانمەو هەندێکیشیان خەیاڵو بیرو بۆچوونمی تیا بەرجەستەکراوە، کە لەوانەیە لای بەڕێزتان نامۆ نەبێ، جیاوازی بیرۆکەکانیش لام پەسەندە، بۆیە ئەیخەمەڕوو. ئەگەر پەردەی شەرم لەسەر هەندێ بابەت هەڵگیرابێ، بەلاتانەوە ئاسایی بێت، هەروەکو چۆن لە ئەدەبی بێگانەدا ڕەچاوکراوە، لە زانستا هیچ پەردەیەك نییەو لە ئەدەبیشا ئاوەڵایەو ئەدەبەکەی ئێمەش هیچ لەوان کەمتر نییە، ئەگەر زیاتر نەبێت، بەڵگەی مێژوویشمان بۆ نموونە ڕشتەی مرواری مامۆستا عەلائەدین سەجادیو شیعرەکانی شێخ ڕەزای تاڵەبانیو شوکری فەزڵیو .... هتد، کە پەردەی شەرمی تیا ئاوەڵا کراوە، هەموو بابەتەکانیش بە ئاسایی وەرگیراوە جێگەی خۆی لە ناو ئەدەبەکەمانا بەرز نرخێنراوەو دەربڕینی هەستەکانم متمانەی زیاترم پێئەبەخشێ.. لەگەڵ ڕێزما بۆتان...

## هەڵوێستەیەك بۆ:

هەندێ کەسایەتی کە دوا ماڵئاوایمان لێدەکەن و لەناکاو جێمان ئەهێڵن، شار و خەڵکەکەی، بگرە کوردوستان بە گشتی پێویستی بەو جۆرە دڵسۆزانە هەیە، بەندەش بۆ یەکێ لەوانە ئەم هەڵوێستە شیعرییەم تۆمار ئەکەم، وەك وەفایەك.. ك٢/٢٠٢٠

پێنووس ناتوانێ پێم دەربڕێ هەست
چەندە هەوڵدەم ناگەمە مەبەست
بێ بەزمییە مەرگ بۆ دڵی شارم
تۆم لێئەسێنێ مات و خەمبارم
ئەم شارەی ئێمە کۆستی کەوتووە
رۆڵەی وەك ئێوەی لە من سەندووە
شارم خامۆشە چرای کوژاوە
تاریکی بەخشە لە هەموو لاوە
رۆڵەی بەئەمەك دەگمەن بەدیکەم
سەری ناحەزی وا پێ نەویکەم
هەڵوێست لەکوێیە کە دەربڕم
جەستەم سڕبووە واق ماوە وڕم
کێیە کە جێگەت پڕبکاتەوە
دڵی خەمباری شار بداتەوە
کۆست لەدوای کۆستە بەشی ئەم شارە
گەرچی نابەزێ بۆ هەڵوێست دیارە

# وەرزی پایزە.

برادەرێکم هەیە ناوی (پایز)ە، سەردانیمکردو هەواڵم پرسی.. نواڕیم سەرمای بووە، نەکۆکیێو نەپژمێ..

وتم پایز چۆنی لەگەڵ پایز؟

وتی برای ئازیز، کۆکەو پژمینو تڕ بەڕیز، ئاوا یەخەی گرتووم پایز..

وتم برادەر فریای خۆت نەکەوی دەرپێش پڕ نەکەی لە میز..

چوارینەیەکم هەیە لەسەر پایز، جێی خۆیەتی لەگەڵ ئەم بابەتە گونجاوە دووبارەیکەمەوە..

پایز هاتەوە بۆ کۆکەو پژمین
تەپڵو تەدارەک تەشقەڵەو تڕین
خوا بتپارێزێ لە میزەچوڕکە
هەتاکو ماوی دۆعا بۆ تڕکە

٢٠٢١/١٠/٢٩

شاگردەکەم هاوسەری نیشانەکردبوو نەیگواستبۆوە، وتم کوڕی باش کەی ئەبی بە پیاو؟! وتی ئاغاگیان ناپیاوی من چییە؟ وتم کوڕ هەتا ژن نەگوازێتەوە پێناوترێ پیاو!

٢٠١٩/١١/٢٨



هاوسەرەکەم وتی عومەر کەڵەشێرێکی کوردی بکرە سێ کیلۆو نیو کەمتر نەبێ.. وتم ژنەکە کەڵەشێربێو کوردی بێ مەحاڵە ئەوەندەبێ، ئەبێ خەفەتی نەخواردبێو بەسەر مریشکا نەتسیبێ!

٢٠١٩/١٢/١



یەکێ لە شاگردەکانم ژنی نەگواستەوە، وتی مام ئاغا گیان گەردنم ئازاکە.. وتم رۆڵە گەردن ئازایی ناوێ، خۆ ناچی بۆ بەرەی جەنگ، یا لە دەریای ئیجە ئاپەڕیتەوە!.

٢٠١٩/١٢/٨



خشتێکی کوورەی کۆنم کـردە پزیـشکی خانـەوادە.. هـەموومان ئـەوە ئەزانین لە وەرزی پایزدا ئەگەر وریای خۆمان نـەبین سـەرماو سـۆڵە کارمـان تێئەکا، ئیتر ئەبێ پەنابەرینە بـەر پزیـشك‌و دەرمـان، یـان هەنـدێ چارەسـەری سروشتی.. بەندە خشتێکم داناوە گەرمی ئەکەم‌و ئەیخەمە سەر شوێنی کۆڵنج‌و هەندێ جاریش لە سەری دائەنیشم. زۆر سوودی هەیە، میوانێکمان ئەخۆشبوو وتی ئاغا زۆر بێتاقەتم، ئەزانی پایز هەر دەردو بەڵایە؟! وتم خەمت نـەبێ ئێـستا دکتۆر خشتت بۆ ئەهێنم چارت ئەکا.. خشتەم گەرمکردو وتم فەرموو دانیشە لەسەری، بە قسەی کردم‌و ئیفاقەی هات!!..



## بامێ...

سالآنە خەڵکانێك بامێی تـەڕ لـە هاوینـا وشـك ئەکەنـەوە بـۆ زسـتان، هەندێکیان بۆ خواردنی خۆیان، هەنـدێکیتریش بـۆ فرۆشـتن.. منـیش بـە پێـی ئیشەکەم لێیان ئەکڕم‌و ئەیفرۆشمـەوە.. وا رێکـەوت ئافرەتێـك هـات‌و داوای بامێی نوقڵی کرد، واتا وردو جوانبێ، لەو کاتەیا ئەمبوو، وتم خوشـکێ گیـان ئەو بامێیەی تۆ لێی ئەپرسی وەختی خۆی هەمبوو، بەداخەوە رۆژگاری تەمـەن بردیەوە، یەکسـەر تێگەیشت‌و وتی ماڵت بەقوڕگیرێ ئاغا، پیاوەکەی منیش بـە داخی ئەو بامێیەوە سەری نایەوە!..

۲۰۱۹/۱۲/۳۰

لەبەردەم دوکانەکەم دانیشتبووم، یەکێك لە کڕیارەکان خوشکێکی بەتەمەنی بەڕێزبوو، وتی ئاغا گیان زۆرمان خۆشئەوێی، یاخوا تەمەن درێژبی، بەخۆشەویستی تۆوە کچەکەم خوا کوڕێکی پێبەخشی ناومانناوە "ئاغا"، منیش وتم پیرۆزبێ، ئاغای ڕێزو خۆشەویستیی هەر وەکو چۆن بە بەندە ئەڵێن ئاغای جوان، ئاغای گوڵ، ئاغای ڕێزو بەزەیی و بەخشش، هیوادارم کەسانی وا جێگرەوەی ئێمەمانانبن..

ژیانیش لەو جۆرانە دانابڕێ و بەخۆداهەڵدان نەبێ، بە لێبوردنەوە..

٢٠٢٠/٣/١



هەستْ.

کە نەخۆشکەوتم، ئەوسا بە تەواوی زانیم خەڵکی منیان چەندە خۆشئەوێ! هەر کۆچکردووەکان مابوون هەواڵم بپرسن!

٢٠١٩/١٢/٢١



وتیان ئاغا ڤایرۆسی کۆرۆنا لە ئارادایە، نەبێ خۆمانی لێبپارێزین.. وتم ئەگەر لە ڤایرۆسی درۆ خۆمان ڕزگارکەین، کۆرۆنای پێئەبەزێنین..

٢٠٢٠/٣/٢٢



هونەرمەندی دەنگخۆش عەدنان کەریم وتی ئاغا باوەڕناکەم لە هەر چوار پارچەی کوردستانا عومەرێکی کەریم ئاغایتر هەبێ..! وتم وەك ناوەکەم؟ وتی وەك خزمەتو پەرۆشی خاكو خەڵك، زۆر سوپاسم کرد، وێنەیەکی یادگاریشمان گرت لە بەردەرکی سەرای سلێمانی.

٢٠٢٠/٦/١٢



کەسێکی درۆزنی ناسراو دەمامکی بەستبوو بە بەردوکانەکەما ڕۆشتو سلاوی لێکردم، وتم فلان بۆ دەمامکت کردووە؟ ڤایرۆسی کۆرۆنا لە ڤایرۆسی درۆ سڵ ئەکا؟! وتی پیاو ئەوەیە بەرگەی هەردوو ڤایرۆسەکە بگرێ!!..

٢٠٢٠/٣/٢٢



پیرۆزبایی جەژنی نەورۆزی ساڵی ٢٠٢٠. واتە ٢٠٢٠/٣/٢١. بۆ خەڵکەکەی

بە بۆنەی جەژنی نەورۆزەوە لەم دۆخە ناهەموارەی (ڤایرۆسی کۆرۆنا)یا، پیرۆزبایی لە سەرجەم گەلی کورد ئەکەم، هیوادارم بە یەکگرتنی هەڵوێستی باوەڕبوون بەخۆمانو ڕێنماییە تەندورستییەکان، ڤایرۆسەکە بەزێنینو بە ئاگری نەورۆزیش بیسووتێنین، ڕۆژێکی پڕ شادیو تەندروستی بەرهەم بێنین..

# ﴾تەڕنەبوون !﴿

لە رۆژی عارفە، پێش جەژنی رەمەزانی ساڵێکی حەفتاکان، جوتێ پێڵاوی چاکم کڕیبوو بۆ جەژن.. بۆ نوێژی ئێوارە چوومە مزگەوت‌و پێڵاوەکانیشم لەپێدابوو، هێندەم دڵپێخۆشبوو نیشانەیەکم پێوەکردبوو، کە نەدزرێ، کە نوێژ لێبووەوە هاتمە دەرەوە سەیرمکرد پێڵاوەکانم نەماوە، ئەم لا پێڵاو ئەولا پێڵاو دیارنەبوو!! ناچار جووتێ نەعلم کردەپێم‌و خۆم گەیاندەوە ماڵەوە، وتیان ئەی پێڵاوەکانت؟ وتم ئێوە خۆش.. ناچار جوتێ پێڵاوی کۆنەم هەبوو بۆ جەژن لەپێمکرد، دوای جەژن بە چەند رۆژێك سەردانی مزگەوتم کردەوە، چەند پیاوێك لەسەر حەوزی مزگەوت دەستنوێژیان ئەگرت، منیش دیققەتی پێڵاوەکانیانم ئەدیا، ئەموت بەڵکو بیدۆزمەوە، بە رێکەوت چاوم پێکەوت‌و ناسیمەوە، چاوەڕێمکرد وتم بزانم کێ دزیویتی، یەکێ لەوانەی دەستنویژیان ئەگرت خەریکبوو پێڵاوەکە بکاتە پێی، وتم خاڵە ئەوە پێڵاوی منە تۆ بردووتەو ئەو نیشانەیەشی پێوەیە، خەریکبوو نکوولی لێبکا، وتم جا شوورەیی نییە پیاو خۆی بە موسوڵمان بزانێ‌و لە ماڵی خوایا دزی بکا؟!

کەچی هیچ پێی شەرم نەبوو وتی لە پێی منا نەبوایە ئێستە شڕبووبوو! لێمەندەوەو پێموت جا لە دز شڕترو شەرمەزارتر هەیە؟! هەر خۆت بە خۆتبی.. پیاوێکی پۆشتەو پەرداخیشبوو، بەڵام نەفس نزمی ئەو کارەی پێکردبوو..

ڕۆژێك کەسێك هاتە دوکانەکەم دوای سلاو وتی ئاغا گیان ئێوەش لە شارا نەمێنن دڵ بە کێ خۆشکەین؟! سوپاسمکرد، وتم خەڵکانێکی کەش پەیانەبن دڵی پێخۆشکەن، ژیان بەردەوامە.. وتی تامی ئێوە نایەن، وتم باشە با ئێمە (بنکڕ)ەکەبین، خوا بکا کەوگیرەکەمان پیا نەهێنن!!

٢٠٢٠/٤/٧



هاوسەرەکەم وتی پیاوەکە زۆر لاوازبووم.. وتم لاوازی چی پاووپووزێکت پێوەیە ئەڵێی پاووپووزی "تاوسە"!! (تاوس) باڵندەیەکی ڕەنگین‌و جوانە، هەر قاچ‌و قولی ناشیرینە..

٢٠٢٠/٤/١٤



نەبێتە مایەی زەم‌و زەمکاری، جاری وا هەیە لەسەر شتێکی بچووك ژن نەیکا بە هەلاو نایبڕێتەوە، منیش بۆ ئەوەی شەڕەکە درێژە نەکێشێ ئەڵێم شەیتان بە نەعلەتبێ.. ئەڵێ بۆ من شەیتانم؟ ئەڵێم خۆت بڕیاربە!!

٢٠٢٠/٤/١٥



رۆژی ٦/٦/٢٠٢٠ ڕێژەی تووشبووانی ڤایرۆسی کۆرۆنا بەرزبووەوە، بەندەش بەپێی ڕێنماییە تەندروستییەکان پابەندبووم بە بەکارهێنانی دەسکێش و دەمامك، دۆستێکم بەدیکرد وتی ئاغا پەیڕەوی داخوازی کۆرۆنات کردووە؟ وتم بەڕێز نەك هەر پابەندی، بەڵکو دەستبەندی و دەمبەندیشم ڕەچاوکردووە!..



لەڕێی دینداریەوە مەبەستی دینی ئیسلامە بۆ مێینە رووداپۆشراو پێینەوترێ (موحەجەبە)، بەڵام لەڕێی ڤایرۆسی کۆرۆناوە خەڵکی بە نێرو مێوە بووە بە (موکەمەمە) واتە دەمامککراو..

٢٠٢٠/٨/١٦



ئەمڕۆژی ٢٧/٨/٢٠٢٠، ئافرەتێکی ئاسیاومان هاتە دوکانەکەم، زۆر بە گەرمی هەواڵی خۆم و هاوسەرەکەمی پرسی، وتم ئەوە خۆم بەو شێوەیەم لەبەرچاوت، هاوسەرەکەشم لەوەتەی گواستوومەتەوە نەخۆشە، نەخۆشیش وەك بوتڵە غازی لێهاتووە لە هەموو ماڵێکا هەیە، لەگەڵ ڕێزما.. تەمەنی هاوسەرگیرێکەشمان پەنجا ساڵی تێپەڕاندووە.. وتی ئەی کە هەمیشە نەخۆشە، بۆ ژنێکی ترت نەهێناوە؟! وتم غیرەتم نەبووە..

ئەمڕۆژی ٢٠٢٠/٩/١٠ بەرەو بازاڕ شۆڕنەبوومەوە، کەسێك لە دواوە هاواریکرد، مام ئاغا گیان، مژدەیەکت بەمێ! وتم فەرموو، وتی لە شاری لیڤەرپوولی بەریتانیا لە یەکێ لە باخچەکانا وێنەی تۆیان دانابوو..! وتم سوپاسی ئەوانو تۆش ئەکەم، دیارە لە باخچەی ولاَتانا جێم ئەبێتەوە، بەلاَم لە ولاَتی خۆمدا، باخچەیەکی وا شك نابەن جێی منی تیابێتەوە..

٢٠٢٠/٩/١٠



باوکی رەحمەتیم پیاوێکی قسەخۆشو دڵپاكو داوێنپاکبوو، لە هەمان کاتا بە کردەوەکانی خەسڵەتی (مەحرەم)ی پێبەخشرابوو، وەك پزیشك، بەندەش بچووکترین منالّی بووم، هەمیشە دوای خۆی ئەخستمو یارمەتیم ئەدا لە دوکانداریو چا بانگکردن بۆ مشتەریەکان، تێبینم ئەکرد کە مشتەرییە ژنەکان ئەهاتنو سلاَویان لێئەکرد، باوکم بەخێرهاتنی ئەکردنو ئەیوت بەمیوانتان بم.. بۆ پیاوەکانیش زۆر ئاسایی بوو..

رۆژێك وتم بابە ئەوە بۆچی بە ژنەکان ئەڵێی بە میوانتانبم؟ بۆ پیاوەکانیش بەو شێوەیە؟ وتی هەتیو ئەوە نیشی تۆ نییە، پیاو هەر نەبێ میوانی ژنبێ..



هاوتەمەنێکم هەواڵی پرسیم، دوای سوپاس وتم..

مێشکم وڕە،

قاچم سڕە،

وەزعم شڕە،

وتی ژیان هیچ نییە پیایا بتڕە..

(تەمەن لە سەروو حەفتاوە)..

٢٠٢٠/٩/٢٤

✳ ✳ ✳

مرۆڤ چۆن بیر لە تێربوونی گەدەی ئەکاتەوە کە پڕبێت، ئەبێ ئاواش بیر لە تێربوونی مێشکی بکاتەوە کە خوێنەری کتێب بێت..

٢٠٢٠/٩/٢٨

✳ ✳ ✳

شەوی یەك لەسەر دووی مانگی نۆی ساڵی ٢٠٢٠، کاتـژمێر (٧:١٠) حەوت‌و دە خولەکی ئێوارە هەور گرمانی‌و یەکەم باران باری لە سلێمانی..

✳ ✳ ✳

نزیکترین مرۆڤ لە مرۆڤەوە پزیشکە بە مانا مرۆڤایەتییەکەی، بەڵام لە هەر شوێنێکا بینایەکی بەرزتان بەدیکرد، وتیان هی فلان پزیشکە، ئەوە بە پارەی نەخۆش دروستکراوە بە مانا مادییەکەی..

٢٠٢٠/٩/٢٨



کوڕەکەم وتی بابە حەز نەکەین تەلارێ دروستکەین بە ناوتەوە، وتم کوڕەکەم من نەو حەزەم نییە، نەگەر لە تواناتانابوو شوێنێك دروستکەن بۆ بەرژەوەندی گشتیی، ئەو کاتە شانازیتان پێوە نەکەم.. تەلاری من بەرهەمە نەدەبیو هونەرییەکانمەو بەتەنگەوەهاتنی ئەو خەڵکەیە، کە نێوەش ئەبێ شانازی پێوەبکەن..

٢٠٢٠/٩/٢٩



مرۆڤەکان لە ڕێی خزمەتگوزارییەوە ئەبنە موڵکی نەتەوە، هیوادارم ئەو پشکەم بەرکەوێ..

٢٠٢٠/٩/٢٩



هاورێیەکی قسە خۆشم، دوای سلاو و هەواڵپرسین وتی: ئاغا گونەکەت خۆم.. وتم: نەزانی بە کەڵکی خواردن نەماوە؟!!

٢٠٢٠/١٠/١

* * *

لەدەست چوو.

کە کار لە کار ترازا

من چی بکەم لە برازا

پەنا بەرم بۆ پوورزا

کەڵکی نییە ئامۆزا

زویر نەبێ خاڵۆزا

داخ بوو بە دڵا چزا

ئەبێ رازیبین رەزا

٢٠٢٠/١٠/٤

* * *

ئەمڕۆژی ٢٠٢٠/١٠/٨، هونەرمەندی گەورەی دەنگخۆشی ئێرانی (شەجەریان) کۆچی دوایکرد.. رۆحی شادبێت، خەسارەتێکی گەورەبوو..

* * *

## سکالا.

تەنها شتێك ئامادەیی خۆی پێراگەیاندم سکالای دڵمی لابکەم، ئەم کاغەزەی بەردەستمە، کە فەرمووی چی لە دڵتایە بۆ منی هەڵبڕێژە، وتم لێت رانەبینم تەنها دۆستێکم هەبێ خۆراگربێ تۆی، بۆیە تا دوا هەناسەم هاورێو هاودەمو هاوخەمو پارێزەرمی.

۲۰۲۰/۱۰/۱۱



ئەمرۆژی ۲۰۱۹/۸/۲٤ بەپێی بریاری پزیشکی پسپۆر (ئارام بارام) لە نەخۆشخانەی شار خەوێنرام بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەری، رۆژی ۸/۲٦ نەشتەرگەریم بۆ کرا، رۆژی ۸/۲۷ لە چاودێری ورد هاتمە دەرێو لە ۸/۲۹ رێگەم پێدرا بچمەوەماڵەوە..



شەوی ۲۰۱۹/۹/۳۰، هەردوو بەرێز عەبدوڵای مەلا نوریو دکتۆر شێرکۆ سەردانیان کردم بۆ ماڵەوە، بۆ بەسەرکردنەوەی باری تەندروستیم، جێگای رێزمن..



ئەمڕۆژی ١٥/١٠/٢٠٢٠، مامۆستای هاوڕێو دۆستو ئازیزم، خاوەن قەڵەمو ئەدەبو شیعرو مرۆڤدۆست، عوسمان هەورامی جێهێشتینو دوامالئاوایی لێکردین.. خەمو پەژارەیەکی زۆری خستە دڵمەوە، داوا لە پەروەردگار ئەکەم بە کردەوە جوانەکانی لێی خۆشبێتو جێگەی بەهەشت بێتو سەبووری کەسوکارو هاوخەمانی بدات..



## ژیان:

وانەیەکە، تاقیکردنەوەیەکە، ڕێڕەوێکە، یاداشتێکە، پاداشتێکە، تاڵییەکە، شیرینییەکە، جوانییەکە، نیعمەتێکە، نوکتەیەکە، ئیشقە، سۆزە، خۆشەویستییە.. مرۆڤ ئازادە هەر بیروبۆچوونێکی هەبێ...

به کۆی گشتی ژیان ئەو ساتەوەختەیە کە تیایدا ئەژیت..

بە تەنها لە هەوڵی ئەوەیابە، پێی پێبکەنی!!

٢٠٢٠/١٠/١٦



زۆربەی ئەوانەی پاسپۆت یان ڕەگەزنامەی وڵاتانیان هەبوو، پۆزیان پێوە لێئەیا، بەهۆی کۆرۆناوە یەکسانبوونەتەوە بە کارتی زانیاری ئێمە..

٢٠٢٠/١٠/٣٠

ئەمڕۆژی ٢٠/١٠/٢٠٢٠، دیاری بەڕێز دکتۆر بەرهەم ساڵح، سەرۆك کۆماری عێراقی فیدراڵم پێگەیشت، کە بریتیبوو لە (تەفسیری کوردی لە کەلامی خوداوەند)ی مەلای گەورەی کۆیە (مەلا محەمەدی جەلیزادە)، دیارییەکی زۆر جوانو بەرزو پیرۆزە، جێگەی ڕێزو ستایشە لە چوار بەرگی قەشەنگدا خۆی ئەنوێنێ (١، ٢، ٣، ٤) لە بەر بەهای ڕێزەکەی تۆمارمکرد..

ئەرکی هێنانی بەڕێز پێشمەرگەو نووسەرو شاعیر، کاك ڕەهبەری سەید برایم گرتبوویە ئەستۆی، سوپاسی ئەکەم..



سەردەمانێك لە دوکانەکەما سێ شاگردم هەبوو بە ناوەکانی (جەبار، سەرکار، بگار)، پێموتن کوڕینە ئەبوایە منیش ناوم (ڕێکار) بوایە، کە سەرپەرشتیاری کارتانم!!

٢٠٢٠/١٠/٢٩



ئەمڕۆژی ٣٠/١٠/٢٠٢٠ سەردانی گەڕەکە کۆنەکەی خۆمانم کرد، کە نەکەوێتە پشت سەرای سلێمانی ئێستاوە، گەڕەکی مەڵکەندی، گەڕەکی لەدایکبوونمە، کە بە کارێزی ئەحمەد زەنگەنە ناوزەد دەکرێت، ئێستا زۆربەی خانووەکان لە لایەن شارەوانییەوە ئیستملاك کراون و داڕووخاوو داتەپیوبوون و کەس لێیان ناپرسێتەوە، بۆتە چۆڵەوانی و وێرانە، بەندەش بە یادی پەنجا ساڵی رابوردووەوە پیایدا گوزەرم کردو یادم کردەوەو هەستم لەم سێ بەیتە شیعرەدا دەربڕی:

کـوڵانـی گـەڕەک وا چـۆڵ و هـۆڵـە
خـانـووی داتەپیـو هـەر خاک و خۆڵـە
ئەو خەڵکە جوانەی رۆژێ زیندووبوون
وان لـە ژێـر خـاکـا بـوونـە پـرپـۆڵـە

یـادی مـنـاڵـیـم ئـازارم ئـەیـا
کوا هەمەڕەنگی، کێ سپی و سوڵە



بەداخەوە، زۆربەی ژنان ناخوازن مێردەکانیان هامشۆی کەسوکاریان بکەن، ئایا ئەوە دروستە؟!!

٢٠٢٠/١٠/٣١

ئارەزووی ئەوە ئەکەم کە لە نواندنا خۆم ببینمەوە، وە لە نوسینیشدا خۆم بخوێنمەوە، چونکە ئەمکاتە رەخنەگر..

٢٠٢٠/١٠/٣١



وتیان ئاغا رات چییە بەرامبەر ڤایرۆسی کۆرۆنا؟

وتم وەکو ئەوە وایە هەموومان سزای لەسێدارەدانمان بەسەردا سەپێنرابێت، یان بەندکردنی هەتاهەتایی، بێ ئەوەی تاوانباربین!!..

٢٠٢٠/١٠/٣١



هەندێ لەوانەی کە خۆیان بە شاعیرو نووسەرو رۆشنبیر ئەزانن، کە بەرهەمێکی ئەدەبییان پێشکەش ئەکەیت، نایخوێننەوە یان چاویان بەرایی نایەت یان ئیرەییت پێئەبەن، ئەتوانم پێیانبڵێم نارۆشنبیر، ئەگەر زیاتریان پێیە با دەستبەکاربن بۆ ئەوەی هەڵیانەنگێنم...

٢٠٢٠/١٠/٣١



ئـەمڕۆژی ٣/١١/٢٠٢٠ لـوتفی خـانی ژنخوشـکم بـەهۆی ڤایرۆسـی نەگریـسی کۆرۆنـاوە دواماڵئـاوایی لێکـردین، کۆسـتێکی گـەورەو گرانبـوو، لەدەستدانی نموونەی ژنی چاك.. بـە داخ و پەژارەیـەکی زۆرەوە بـۆ خانـەوادەو هەموو کەسوکار، دڵی هەموانی هەژاند.. خوای گەورە بە بەهەشتی بەرینی شاد بکاتو سەبووریمان بدات..



**ئامۆژگاری...**

بۆ ئەوەی دڵخۆشبیت،

دڵەڕاوکێ لەخۆت دووربخەرەوە..

بۆ ئەوەی دڵگەشبیت،

دڵی کەس مەڕەنجێنە..

بۆ ئەوەی سەربەرزبیت،

حەز بە سەرنەوی کەس مەکە..

بۆ ئەوەی تەندروستبیت،

پاکوخاوێنی بپارێزەو جێگۆڕکێی زۆر بکە..

٢٠٢٠/١٠/٦



ئـەمڕۆژی ١١/١١/٢٠٢٠، بـەداخ‌و کەسـەرێکی زۆرەوە کەسـایەتی شارەکەمان، کاك قادری حاجی عەلی بـەهۆی نەخۆشـی ڤایرۆسـی کۆرۆنـاوە، دوامالّئاوایی لێکردین، خەم‌و پەژارەیـەکی زۆری خـستە دلّـمـەوەو کۆسـتێکی گەورەبوو لە خانەوادەو خەمخۆرانی کەوت..

ڕۆحی شادو ئاسوودەبێت‌و خوا سەبووری هـەموو کەسـوکارو دۆسـتانی بدات..



ئـەمڕۆژی ١٩/١١/٢٠٢٠ لـە دوکانەکـەم خوشـکێکی قەلّـەوی تێکسمڕاوی پڕجوولّەو ورەو خڕوخەپان بە ڕوویەکی گەش‌و خۆشەوە سلاّوی کردو وتی ئاغا گیان داودەرمانی کفتەم بەرێ.. وتم بەسەرچـاو، لـەوە ئەچـێ کچی سابونکەران بیت، وتی چۆنت زانی؟ وتم ماشالّلاّت لێبێ ئەلّێی ڕیکلامی کفتەیت.. وتی کـەس وەك منـی لێنانـێ.. ئـەی نـازانی کفتـەی سـابونکەران ناوبانگی خۆی هەیە؟! وتم بەلّێ ئەزانم..



تەنها داخێك کە کاریگەریێ لە دەروونما، دەرفەتی زیـاترم بـۆ نەڕەخـسا کە خزمەتی زیاتر بکەم، ئەگەرچی لە باریشما هەبوو کە بەردەوامبم!!

٢٠٢٠/١٢/٢٧



تێبینی ئەوەم کردووە، ئەو ژنانەی باشن، مەرگیان پێش مەرگی پیاوەکانیان ئەکەوێت، خراپەکانیشیان لای کەم دە پانزە ساڵ دوای پیاوەکەی ئەژی.. پیاوی خراپیش ژنکوژەیە، کەم بەدینەکرێ ژنو مێرد هەردوکیان باشبن!! خێزانێکم لەو جۆرە باشە ئەناسی، پێموتن هەزار ساڵ تەمەنتان بێت، ئێوە هەردوکتان پێکەوە ماڵئاواییمان لێئەکەن!!..

٢٠٢٠/١١/٢٣



ناشیرینترین دیاردە سواڵکردنە، کە مرۆڤ سووکایەتی بە کەسایەتی خۆی ئەکا، زۆربەی سواڵکەرەکانیش درۆئەکەنو کردوویانە بە پیشە. سواڵکەرەکان کە ئەگەڕێن بۆ سواڵکردن، بە خەڵکی ئەڵێن هەتیومان هەیە، خێرێکمان پێبکەن، یەکێ لەوانە هاتە لای من پێموت من خێر بە چەتیو ئەکەم نەك هەتیو..

٢٠٢٠/١٢/٧



هاوسەرەکەم وتی پیاوەکە هەموو گیانم سڕبووە!! وتم ژنەکە بەس نییە زمانت سڕ نییە!!

٢٠٢٠/١٢/٢٤



بەرگی شەشەمی کەشکۆڵەکەم بە کوڕەکەما نارد بۆ هۆڵەندا، کە خۆی رەگەزنامەی هۆڵەندی هەیە، وتم دیارە لەوێ هاوڕێیەتی لەگەڵ کەسێکی هۆڵەندیا هەیە، بێگومان من ئەو کەسە ناناسم، بەم شێوەیە ویستم یەکێ لەو بەرگەی پێشکەش بکەم.. بۆم نووسی:

پێشکەشە بەو هۆڵەندییەی نە ئەیناسمو نە ئەمناسێ، نە زمانم ئەزانێو نە زمانی ئەزانم. هەر بۆ ئەوەی کە مرۆڤەکان لەڕێی ئەدەبەوە هەستو سۆزی یەکتر بناسنو لەیەکتربگەن، بێ گوێدانە هیچ جیاوازییەك، تەنها وەك مرۆڤ!

٢٠٢٠/١٢/١٣



بەرزانی سەعەی گەهەر پیاوێکی قسەخۆشو خۆش مەشرەبە، نێوانمان توندوتۆڵە بۆ دەربڕینی قسەی خۆش ئاڵوگۆڕێکی باشمان لە نێواندایە.. لەم رۆژانەیا لە چەقی بازاڕا بەیەك گەیشتین، دوای سڵاو وتم چۆنی لە چیایت؟ وتی گوێرەکە باشە.. وتم دیارە گوێرەکەیەکیشت تیا نابێ؟!

٢٠٢٠/١٢/١٦



٢٠٢١/١/١، رێکەوتی رۆژی هەینی کرد، کە رۆژی پشووە..



ئەمڕۆژی ٢٠٢٠/١٢/٢٠ نرخی دۆلار بەرزییەکی نـاڕەوای بەخۆیـەوە بینیو خەڵکێکی زۆر تیا زەرەرمەنـد ئـەبن، بـە تایبـەتی کەسـە ئاسـاییەکان.. تووشی کەسێکی هاوڕێی ناوبازاڕ هاتم، کە بازرگانەو سەرمایەدارە، وتم لـەگەڵ ئەم وەزعەیا چۆنی وتی سـەرمایەدار زەرەر ناکـا.. منـیش وتم خـوا رەحـم بـە بنمایەدارەکان بکا...



هـەر لـە ڕۆژی ٢٠٢٠/١٢/٢٠ وتیـان ئاغـا دۆلار فـڕی!! وتم: وایـە میللەت تری (بێ سێو دوو میللەت تری)!!



ئەمڕۆژی ٢٠٢٠/١٢/٢٢، کەسـێکی قەڵـەوی تەنگەقـەوی بـەرەوپیرم هات، سڵاوی کردو وتی ئاغا سەدو سی کیلۆم چـیبکەم باشـە؟! وتم ئەگـەر ببیت بە سەدو بیسـتو دوو ئەبیت بە فریاکەوتنی تەندروستی، سـەدو پـانزەی بەرگری شارستانی ئاگرکوژێنەوە، وەئەگەر سـەدو چـوار بیـت ئەبیتـە هێـزی فریاکەوتنی خێرا، خۆ ئەگەر سەدو دوو بیت ئەبیتە بەدالەی تەلەفۆنات!! وتی با تەلەفۆناتەکەبم..



بەندە تێکەڵاوییەکی باشم هەیە لە گەڵ هەورامییەکان، هەر کاتێ دەرفەتم سازبووبێ سەردانی دەڤەرەکەیانم کردووە.. بۆ دوا جار لە شارۆچکەی تەوێڵە سەرنجی خانووەکانم دا بە قەدپاڵی شاخەکانەوە کە کاتی خۆی هەمووی بە وشکە کەڵەك هەڵچنرابوو، دیمەنێکی سروشتی سەرنجڕاکێشی هەبوو گوزارشتی لە ئازایەتیو لێهاتوویی دانیشتووانەکەی ئەکرد، بەڵام ئەمجارەیان کە نوارِیم هەندێ لەوانە بلۆکی تێکەڵاوکرابوو، زۆرم پێناخۆشبوو، سروشتی کرداری هەورامییەکانی شێواندبوو..

لەم ڕۆژانەیا یەکێ لەو دۆستانە وتی ئاغا بۆچی سەردانێکمان ناکەیت؟

وتم برادەر سەردانی چیتان بکەم؟! ئەتەوێ خەفەتبارمکەی؟! سروشتی جوان لای ئێوە پارێزراوبوو ئێوەش لەدەستاندا بەداخەوە...



هەر لە منالیمەوە هەستی هاوکاریو بەتەنگەوەهاتنو پەرۆشیم تیا خولقاوە، بە ئامۆژگاری باوکی ڕەحمەتیم هەمیشە هاوکارو هاوخەمی دەوروبەربووم، یارمەتی هەندێ لە هاورێ قوتابییەکانم بووم، تیایانا هەبوو پێینەوتم باوکی (تیۆری باوکیشمان کردارییەکەیە)، واتە "عملي ونظري"..

٢٠٢١/١/٤



## پاکوخاوێنی...

هاوژینەکەم لەڕووی پاکوخاوێنییەوە زیاد لــە پێویــست گرنگــی پێــەیا، کورد واتەنی ناخۆشی کردووە! زستانو هاوینی بۆ نیە، هەر کاتــێ دەرفــەتی بۆ هەڵکەوێ قورگی جلشۆرەکە ئەگرێ، جاری وا هەیە کە دیارنامێنێ ئەڵێم ڕەنگە جلی بۆ شتن دەست نەکەوتبێ خۆی هاویشتبێتە ناو جلشۆرەکەوە!!

* لیفەیەکی لە ناو شوێنی نوێنەکان دەرهێنابوو بێ ئەوەی چڵکنبێت، فڕێی یابوە جلشۆرەکەوە.. بە هەڵخستنیا زانیم ئەو کارەی کردووە..

٢٠٢١/٣/١



بــرادەرێکم ســکاڵای ئــەوەیکرد، کــە گوایــە ژنەکــەی قــەت بــۆی پێناکەنێ..وتم بەڕێز ئەگەر غیرەتت هەیە پێبڵێ ئەبوایە تۆ ناوت "خەنــدە" یــان "ڕووخۆش" بوایە!!

٢٠٢٠/١٢/٢١



ژنێك هاتە دوکانەکەم وتی ئاغا گیان ڕەشکەی سپی هەیە؟ وتم خوشــکێ گیان ڕەشکە ناوی خۆی بەخۆیەوە، کە ڕەشە، چۆن سپی ئەبێ؟!!



ئەمڕۆژی ٢٠٢٠/١٢/٢٩ سەر لە ئێوارە لە بازاڕەوە گەڕامەوە ماڵەوە، دوای نانخواردنێکی کەم و پشوودانێك، هەر خۆم و هاوسەرم بووین، لە دڵی خۆما وتم با پێکەنینێ دروست بکەم، بە دەنگێکی زوڵاڵ وتم ڕەحمەت لەوەی ماچێکم ئەیاتێ.. وتی نەعلەتم لێبێ ئەگەر بتدەمێ، ئەینازانی کۆرۆنایە؟!!



برادەرێکمان هەیە هەر شەوەی لە باخێکەو قەلو قازو مریشك و کەڵەشێر، ئەوەی پێیبڵێن پەلەوەر نۆشی ئەکاو پارە نایا، خۆشی خەریکی بەخێوکردنی ئەوانەیە.. بەڵام کەس سفتاحی لێناکا! برادەرەکەی هات و وتی ئاغا قەلو مریشك و پەلەوەرەکانی فلان تووشی نەخۆشی بوون و قڕیان تێکەوتووە.. منیش وتم برادەر ئەو قڕی خستۆتە پەلەوەری خەڵکیەوە، ئەبێت قڕیش بکەوێتە پەلەوەریەوە..

وتی ئەشهەدو وایە..

٢٠٢١/١/١



وتیان ئاغا کەی کوردوستان رزگاری ئەبێ؟

وتم کاتێ یاسا سەروەربێ و بتوانێ دزی گەورە بە سزای خۆی بگەیەنێ!!

٢٠٢١/١/١٥



سوپاسگوزاری..

سوپاسی هەموو ئەو بەڕێزانە ئەکەم، کە بەندە بە نموونەی شارێك، گەڕەکێك، ماڵێك یان خێزانێك ئەخوێننەوە بە باشی..

٢٠٢١/٢/١١



دەنگۆی ئەوە هەبوو کە حکومەت بڕی سەد هەزار دینار ئەدا بە بێوەژنەکانو هەندێ لە خەڵکی هەژار، کە ناویان تۆمار کرابوو.. یەکێ لە بێوەژنەکان دیاربوو منی ئەناسی وتی ئاغاگیان من لە شوێنی دوورەوە بە تاکسی هاتوومو نەبێ بە تاکسیش بگەڕێمەوە، پارەکەشیان نەیامێو دوو مێردیشم کردووە، هەردوکیان بە رووداوی ئوتومبێل لەناوچوون.. منیش برێ پارەم دایەو پێی گەشایەوەو زۆری پێخۆشبوو.. وتم خوشکی بەڕێز مێردیتر نەکەی، نەبا خوانەکردە رووداوێکی ئوتومبێلیکە رووبداو لەناوبچێ!..

٢٠٢٠/١٠/٢٠



وتیان ئاغا بۆ وازت لە هونەر هێناوە؟

وتم هونەر وازی لە من هێناوە، بەو بارودۆخەی ئەمڕۆ کە خولقاوە..

٢٠٢١/١/١٦



جێی داخە زۆربەی گەڕەکە کۆنەکانی شـار یـا رووخـاون یـان بـوون بـە گۆڕەپـانی گـەراج و عارەبانـەو شـێوێنراون.. لێرەیـا مەبەسـتم لـە یـەکێ لـەو گەراجانەیە کە ئەکەوێتە پشتی سەرای سـلێمانییەوە نـاوی لێنرابـوو (گـەراجی مـەرد). هـەر بـۆ سـوعبەت چـوومە لای سەرپەرشـتیارەکەی وتم بـۆ گـەراجی نەوێترێـشتان هەیـە؟ وتـی راسـت ئەکـەی ئەبوایـە ئـەوەش هەبوایـە، کـە پێچەوانەکەیەتی..

ئێبینی: زۆربەی شتەکان پێچەوانەیان هەیە، بۆ نموونـە تـاڵ: شـیرین، جـوان: ناشیرین، ئازا: ترسنۆك، .... هتد...



برادەرێکم هاتە لام، وتی ئاغا دوعایەکی خێرمان بۆ بکـە.. وتم یـاخوا لـە گەرمایا سەرماتبێ و لـە سـەرماشا گەرماتبێ.. وتی تا ئێستا کەس دوعای وای بـۆ نەکردووم!..

بۆ خۆشم ئەپاڕێمەوە، خوایە قەرزارتان بم و قەرزاری عەبدەکانت نەبم..

٢١/٢١/١/٢٨



## نێبینی کاری دزێو..

مرۆڤەکان بە گشتی پیرۆزن و جێگەی ڕێزن، بەڵام هەندێ لەوانە هەڵئەسن بە کاری ناشایستە، کە لە ئاستی گەورەیی مرۆڤدا نییەو دایانئەبەزێنێ..

یەکێ لەو کارە قێزەونانە دیاردەی سواڵکردنە، لەوەش خراپترو دزێوتر بەکارهێنانی منالە بۆ بزواندنی هەستو سوزی کەسانی دیکە بە کورتی هەستی خۆم لەم چوارینەیەدا واڵا ئەکەم:

گوناهە منـاڵ سواڵی پێئـەکەیـت

بەوە کارێکی زۆر خـراپ ئەکەیـت

مـناڵ پیـرۆزە بـاخـچەی ژیـانـە

لە ئاست پارەیا باخت وشکەکەیت

٢٠٢١/٢/٦



کەسانێك کە سەردانم ئەکەن ئەڵێن ئاغا ئێوە نموونەی ئەم شارەن، بەس نییە بەجێتان ئەهێشت.. بەندەش ئەڵێم کەسێك کە نموونەی شارێکبێ چۆن دڵی یەت بەجێی بهێڵێ!! (شاری سلێمانی)..

٢٠٢١/٣/١٧



رۆژی ٢٦/١/٢٠٢١، کاڵفامێـك نـارەوایی بەرامبـەرمکردو، کـاری تێکردمو دڵی ئێشانم بە خۆڕایی، نزیکـی کردمـەوە لـە تووڕەبـوون، بـەڵام دانم بەخۆماگرت، دەنگم نەکرد، لە راستیا بێتاقەتبوومو خۆم نەخستە ئاستیەوە بـۆ وەڵامدانـەوە، نەگەرچـی لـە دڵـی یـابووم.. کـە هاتمـە ماڵـەوە بێتاقـەتبووم، لەبەرخۆمەوە وتم شەیتان بە نەعلەتبی، نەمزانی ژنەکەم لەولامەوەیە، وتی ئـەوە چیتە کابرا لەگەڵ منتە؟ وتم بۆ ژنەکە تـۆ شـەیتانی؟ مەسـەلەکەم بـۆ گێڕایـەوە باشبوو قەناعەتی کرد لە خوا بەزیادبێ..

٢١٢١/٢/٧



هەموان ئەزانین لەم دۆخەیا هەستو سـۆزو بەتەنگـەوەهاتن کەمبۆتـەوە، یان لەڕێی ئـامێرەوە پەیوەنـدی ئـەکرێو تـامو چـێژی نییـەو کاڵبوونەوەیـەکی کۆمەڵایەتی هێناوەتە کایەوە، لە نێوان مرۆڤەکانا، تەنانـەت لـە نێـو خێزانیـشدا رەنگی داوەتەوە.. تـا رادەیـەکیش بۆتـە هـۆی دڵتـەنگی مرۆڤـەکان، بەنـدەش بۆنەوەی خەندەیە بخەمە سەر لێوتان:

* وتیان ئاغا لەگەڵ کاری شەوا چۆنی؟

* وتم لەوەتەی حەفتام تێپەڕانـدووە، بـە (ئـۆنلاین) پەیوەنـدی ئەکـەم بـە ژنەکەمەوە!!..

٢٠٢١/٢/٨



ئەمڕۆژی ١٦/٢/٢٠٢١ مانگی رەشەمێ، پشیلەکان میاومیاویانبوو، هەر نێرەبوو بە دوای مێیەکەیەوە رایئەکرد، بەندە لێم ئەنواڕین، دوانیان لەسەر دیواری حەوشەکەمان جوتبوون، نیشە خێرەکەیان ئەکرد، ژنەکەشم ئەیوت عومەر ئەو پشیلانە دەرکە ماڵەکە پیس ئەکەن.. وتم ژنەکە وەرە سەیریانکە، چۆن رێ بە خۆم بەم لەو کارەیان بکەم، کە تەماشای کردن، دایە قاقای پێکەنین، ئیتر نە جاریك، نە دوان، نە سیان، لەبەر چاوی ئێمە کردیان.. وتم ژنەکە بە چاوی خۆت دیت چۆن تامی تامی ئێمە نەیەن؟! نەزانن هیچمان لە بارا نەماوە، ئێمەش لە سالآنی حەفتاکانا وەك ئەوانەبووین، بەلآم ئێستا ئێمە لە حەفتاکانی تەمەناین!!..

ئێبینی:

(پەنجاو یەك ساڵ لەمەوبەر، لە مانگی هەنگوینییابووین).



ئەمڕۆژی ٢٦/٢/٢٠٢١ رۆژێکی ساردی وەرزی زستانە، کورد واتەنی کەر ئەیبەستێ.. یەکێ لە ئەندامانی حیزبی کەران هاتە دوکانەکەم، بەندە هێندە سەرمامبوو هەڵئەلەرزیم.. دوای بەخێرهاتن، وتم زۆر ساردە کەر ئەیبەستێ.. وتی ئەزانم ئەڵێی چی.. من لەو کەرانە نیم کەری ئەسڵیم..

ئێبینی: لە ناو ئێمەیا گوزارشت لە رۆژی سارد بەو شێوەیە ئەکرێ..



## سەرنج..

هەندێ لە دایكو باوکان منالەکانیان ئەهێنن بۆ بازار چەكو تەقەمەنی پلاستیکیو نایلۆنیان بۆ ئەکڕن، بەندە زۆرم پێناخۆشە، بەدایكو باوکەکە ئەڵێم ئەوە کارێکی خراپە، منالەکان بەرەو شەڕەنگێزی ئەبات، پێنووسێکیش پێشکەشی منالەکە ئەکەم، کە چەکی ئێمەیە..

٢٠٢١/٣/١١



بەندە لە ساڵی ١٩٦٤ەوە خەریکی کاری هونەریم، کە تا ئێستا ئەکاتە (٥٧) پەنجاو حەوت ساڵ.. باوکی رەحمەتیم (٥٧) پەنجاو حەوت ساڵ ژیاوە.. تەمەنیشم (٧٨) حەفتاو هەشت ساڵە.. لە ١٩٤٤ بۆ ٢٠٢٢.. لە سەرژمێری ساڵی (٥٧)یشا بە ٧/١ تۆمارکراوین.. واتە پێنج (حەوتی) هاتووە..

٢٠٢١/٣/١٢



پۆزش..

لێم ببوورن کە ناوی مامۆستای گەورەو پایەدار (عەلائەدین سەجادی)م بە (عەلائەدین سوجادی) ناو هێناوە، واتە (سەجادی)یە..

٢٠٢١/٣/١٥



ژنێکی ناسیاومان مێردەکەی ژیانئاوایی لێکردین، ناوی (فلان)بوو، دوای ماوەیەك شوویکردەوە بە کەسێکیتر هەر هەمان ناوی هەبوو، رێکەوت وابوو مێردی خوشکەکەشی ژیانئاوایی لێکردین..

پاش ماوەیەك هاتە دوکانەکەم وتی فلانی خوشکم ناوی مێردەکەی خۆی دەستکەوتەوە.. بەڵام بۆ نەگبەتی ناوی مێردەکەی من دەگمەنە، تا شوویەکی لەو جۆرە بکەمەوە.. بەندەش وتم ئەوە شانسی من نییە ئەو ناوەم هەبوایە.. ئەویش وتی جا کوا ئەو ناوەت هەبوایە!! بەڵام راستیو دروستی ئەو دەرزییەم نەماوە بخرێتە سەر قەوانو خشەی لێبێ!!.. تەمەن (٧٨) حەفتاو هەشتە!!

٢٠٢١/٣/١٤



کەسێکی زۆر درۆزن، ناوو ناوبانگی درۆکانی دەنگی یاوەتەوە!.. ناسیاوی منە، یەکێ لە هاورێکانی وتی ئاغا فلانکەس درۆی تەرکیاوە.. وتم مەحاڵە شتی وا نابێ.. چاوم بە درۆزنەکە کەوتەوە، وتم راستە ئەڵێن درۆت تەرکیاوە؟! وتی ئەوە چ بێقیمەتێکە ئەو بوختانەی بۆ هەڵبەستووم؟ خۆ ئەمڕۆ یەکی چوار نییە!.. (٤/١ مەبەست لە درۆی نیسانە)..

٢٠٢١/٣/١٨



لە یەکێ لە گوندەکانی دەوری سلێمانی، سەرقاڵی تۆمارکردنی کاری هونەری بووین، لە میانی تۆمارکردنا، کە دەرهێنەر ئەیوت (ئەکشن – Action)، گوێدرێژێك لەولاوەبوو دەستی بە زەڕین ئەکرد، کارەکەی لێتێك ئەداین.. چەند جارێك دووبارەبووەوە.. ناچار دەرهێنەر بە خاوەنەکەی وت کەوا لێمانی دوورخاتەوە.. کەچی وتی کەرەکەی منیش ئەیەوێ بەشداریتان لەگەڵ بکات!..

تێبینی: جاری وا هەبووە بۆ کاری هونەری یەکمان لەسەر گوێدرێژێك کەوتووەو دەسمان نەکەوتووە.. (ئەکشن) واتە دەسپێکی تۆمار، وشەیەکی ئینگلیزییە..

٢٠٢١/٣/١٧



یەکەم کەسبووم، کە لە بواری وەرزشی سەنتەری بابان بەشداریمکرد، وەك هونەرمەندێك لە ژێر دروشمی "وەرزش بۆ هەموانە" بە شانازییەوە رەنگدانەوەیەکی بەرچاوی هێنایە کایەوە بۆ هاندانی هاوولاتیان، ئێستاشی لەگەڵابێت لە پارکی ئازادییەوە سەرچاوەی گرت.. بە سەرپەرشتی مامۆستاو پارێزەرو نووسەر جەمال بابان.. رێکەوتی ٢٠٠٦/٧/١٧..

٢٠٢١/٣/٢٠



لە هەر وڵاتو شارو شوێنێکا جێگەی پێناسەی دیاریکراوە.. بەندە سەردانی زۆر وڵاتم کردووە، نامەوێ ناوی هەموو شوێنەکانیان بەرم.. نموونەی ئەوانە لە ئازربایجانا (قەڵەچەنە) هەیە لە ئێرمینیا (هارەپارە).. هەر گەشتیارێك سەردانی ئەو وڵاتانە بکات پێویستە چاوی بەو شوێنە گەشتیارییانە بکەوێت، کە پێناسەی وڵاتەکەن، بە نموونە ئەو دوو وڵاتەم دیاریکردووە، کە رزگاریان بووە لە جەورو ستەم، خۆزگە کوردستانەکەی ئێمەش بەو مەرامە بگەیشتایەو ئەو پێناسانەی دەستەبەرکردایە..

٢٠٢١/٣/٢١



لە کاتێکدا لە ئاودەست بووم، هاوسەرەکەم وتی عومەر لەکوێی؟ وتم لە تەوالێتم.. وتی چی ئەکەی؟ وتم نازانی لە تەوالێتا چی ئەکرێ؟!

٢٠٢١/٣/٢٢



لەگەڵ پیرەژنێکی ناسیاوما نێوانمان خۆشەو شەرممان لەیەك شکاوە، وتی ئاغا گیان یاخوا قەت نەمری، وتم مردیشم بە گونتەوە.. وتی جا کوا گونم بووایە. وتم بشتبوایە وەك ئێستای من بەسوود نەبوو..

٢٠٢١/٤/٤



## پێتان سەیر نەبێت..

دوای ئەوەی کە مووچەکەم وەرگرت، سەردانی یەکێ لە فەرمانگە حکومییەکانم کرد، کە پێویستییان چییە بۆیان دەستەبەرکەم، وەك نەریتی ساڵانەم بۆ هاوکاریان.. سەرپشکم کردن بۆ شوێنێکی دیاریکراو کە پێداویستییەکانیان لەوێ بکڕن بە ناوی بەندەوە دوای ئەوەی کڕیبوویان بە بڕی (٣٤٤,٥٠٠) سێ سەدو چلو چوار هەزار دیناریان پێویستبوو.. مووچەکەشم (٣٥٣) سێ سەدو پەنجاو سێ هەزاربوو، تەنها (٩) نۆ هەزارم بۆ مابووەوە.. تێبینی: نیوەکەی لێنەسەندم، خاترانە..

مووچەی خانە نشینییەکەم دوای (٢٧) ساڵ فەرمانبەری (٤٤٨) چوار سەدو چلو هەشت هەزار دیناربوو.. لە سەدا ٢١٪ بیستو یەکی لێدەرکەی (٣٥٣) هەزاری ئەمێنێتەوە..

٢٠٢١/٣/١٧



ئەمڕۆژی ٢٠٢١/٤/٥ کوڕێکی گەنج داوای لێکردم وێنەی لەگەڵ بگرم، داواکەیم پەسەندکرد.. وتی زۆر سوپاس، ئەزانی مام ئاغا ناومانناوی پێشمەرگەی شانۆ؟! ئەو رستەیە یەکەم جاربوو ناراستەم بکرێ لەبەر گەورەیی پێشمەرگەو پیرۆزی شانۆ تۆمارمکرد..



زۆر جار مرۆڤەکان لە منالییەوە کە گەورەئەبن، پێچەوانەی منالییانە، نموونەی ئەوەی منالێك هاروهاجە، کە گەورەئەبێ کەسێکی ئاقڵو لەسەرخۆیە.. یان درەنگ زمان نەگرێ، کە گەورەئەبێ زمانڕەوانو پاراوە.. نەشێ منالی پێوەر نەبێ بۆ گەورەیی..

دایکی رەحمەتیم هەموو جارێ ئەیفەرموو عومەر تا تەمەنی چوار ساڵێت زمانت نەگرتبوو، نەترساین لەوەی زمان نەگری.. کەچی سوپاس بۆ خوا ئێستا خەڵکی پەرۆشی ئەوەن گوێ لە ناخاوتنت بگرن..

٢٠٢١/٤/٧



ئەمڕۆژی ٢٠٢١/٤/٩، کیژۆڵەیەکی نازدار سەردانی دوکانەکەی کردم، دوای سلاو، وتی مام ئاغا هاتووم یەکێ لە بەرگی کەشکۆڵەکانتم بکەیتە دیاری.. وتم بەسەرچاو، ناوت چییە؟ وتی (دیە).. ناوێکی کوردی سەرنجڕاکێش.. بەم شێوەیە پێشکەشمکرد.. (دیاریو یادگاریم پێشکەشە بە دیەم، دیەخان.. لەگەڵ رێزما..)

تێبینی: ناو، پێناسەی خاوەنەکەیەتی..

(هەر رەگەزێ پێویستە ناساوی خۆی هەڵگرێ)

٢٠٢١/٤/٩



ئەمڕۆژی ٢٠٢١/٤/١٣، ڕێکەوتی یەکەم ڕۆژی مانگی ڕەمەزان، تێبینی ئەوەمکرد خەڵکانێکی زۆر ئاپۆرایان بەستبوو بۆ سەرەی شەربەت و لوقمەقازی، منیش یەکسەر ئەم بەیتەم هات بە خەیاڵاو تۆمارمکرد..

**میللەتی شەربەت و لوقوم**

**لە چلەی هاوین ئەبێ بە زوقوم**

زوقوم واتە بەستەڵەك ئەیبەستێ، پێچەوانەی ڕووداو..



داواکاری مرۆڤانە..

ئامۆژگاریم بۆ مرۆڤەکان بە گشتی و مرۆڤی کورد بەتایبەتی ئەوەیە، کە هەمیشە لە هەوڵی خۆڕۆشنبیرکردنابن، خوێندن و خوێندنەوە بکەنە نەریتی ڕۆژانە بۆ ژیانتان، چۆن خواردن بۆ گەدە پێویستە، خۆراکی مێشکیش لەو کەمتر نییە، تا مرۆڤەکان هەموو یەکتریان خۆشبوێت، بێ گوێدانە ڕەگەزو ئاین و بیرو باوەڕو بۆچوونەکانیان، تا بتوانن یەکسانی بچەسپێنن، مرۆڤ ئازادو ئاسوودەو بەختەوەربێت، هیچ دەسەڵاتێکی گەندەڵ کاریان تێنەکات..

٢٠٢١/٤/٢٩



## سکالا یەک..

هەندێ جار ئازاربەخش نزیکترین کەسانێکن کە پێیان ئەوترێ ماڵو منداڵ، کە ڕێگری لەو خواستانە ئەکەن کە تۆ مەبەستتە، بۆ نموونە کاری هونەریو ئەدەبیو بگرە کۆمەڵایەتی.. هەموان ئەو شتانەی کە تۆ مەبەستتەو باوەڕت پێیەتی.. بۆیە ناچار سکاڵام ئەخەمە سەر کاغەز بۆ دەربڕینی هەست..

بێگومان کارێکی ناڕەواو نەشیاوە، تەنها بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیان تۆیان ئەوێت، کە دواجار پەشیمانی دادیان نادات..

٢٠٢١/٥/٦



## سەرنج..

مرۆڤەکان هەر یەکێکیان دوو کەسایەتییە، یەکێکیان بەرەنگاریو زاڵبوونە بەسەر گیروگرفتەکانا، ئەویتریشیان جۆرێکە لە خۆبەدەستەوەدان.. یەکەمیان ئەرێنییەو دووەمیشیان نەرێنییە.. ئەرێنییەکان هەمیشە سەرکەوتوونو زاڵن.. ئەویتریشیان پێچەوانەکەیەتی.. جاری واش هەیە تێکەڵی دروست ئەبێ، گرفتاری دروست ئەکات.. ئەبێ هەوڵدەین ناوبژیوانێکی ئەرێنی بۆ بێنینە کایەوە، نەرێنی وەلاوەنێن..

٢٠٢١/٤/١٥



## بەرۆشی ژینگە..

رۆژی ۲۰۲۱/٤/۱۷، سەردانی باخچەی دایکم کرد وەك نەریتی رۆژانەم لەگەڵ بەرپرسی باخچەکە ئەندازیار کاك (رەعد) ئاخاوتنمکردو پرسیاری ئەوەم لێکرد ئایا نەمامی زیادەیان هەیە بۆ چاندن؟ وتی چەند نەمامێکمان هەیە.. وتم ئەکرێ بەکاریبهێنین بۆ خەستەخانەی (عەلی کەمال) چەند جێگەیە داریان هەیە لەسەر شۆستەکەی بە رووی شەقامی (حەمدی‌و پیرەمێرد)ا، وتی بەسەرچاو، بەڵام ئەبێ ئاودانی مسۆگەر بکەی بۆ ئەوەی وشك نەبن.. وتم پەیوەندی ئەکەم بە بەرپرسەکەیانەوە دوای ئەوەی پەیوەندیم کرد زۆریان پێخۆشبوو، وتیان باخەوانیشمان هەیە بۆ ئاودانی.. وەڵامم گێڕایەوەو یەکێ لە باخەوانەکانی خەستەخانەکەشم لەگەڵ خۆم بردو بەپێی چاڵی درەختەکان نەمامیان بۆ دابینکردن، بەوەش توانیم ئەرکێکی سەرشانم کەم بکەمەوە هەموو کەس بەرپرسە لە جوانی شارو ژینگەکەی..



ئەمرۆژی ۲۰۲۱/٤/۲۱، خەڵاتی رێزلێنانم پێبەخشرا لەلایەن یەکێتی نووسەرانی کورد / لقی سلێمانی، لە یادی پەنجا ساڵەیدا، لە ژێر ناونیشانی (یۆبیلی زێڕین)، جێگەی رێزو پێزانینمە، سوپاسیان ئەکەم..



ئەمڕۆژی ٢٤/٤/٢٠٢١، "سەریاس"ی برازام دواماڵئاوایی لێکردین، خەمێکی پڕ سۆبوو.. داوام لە پەروەردگارە بە بەهەشتی بەرینی شاد بکاتو دوا کۆستی بنەماڵەکەمان بێت..

(ڕۆژی یادی بۆمبارانی قەڵادزێی بریندارببوو)..



گومانی تیا نییە هیچ شوێنێك هێندەی ماڵە باوكو دایك پیرۆز نییە، کە سەرچاوەی سەرهەڵدانو نشونمای مرۆڤەکانە، بەڵام جێی داخو نیگەرانییە کە زۆربەی ماڵە باوانەکان بەر لێشاوی رووخانو دارمان کەوتوون، بوونە گۆڕەپانی گەراج، سیمای یادگارییان پێوە نەماوە.. من وەك وەفایەك چەند خشتێکی ماڵی باوکم هێناوەتە ماڵەکەمەوە هەوڵئەیەم بیانپارێزم، دوای خۆشم پاراستنی ئەکەوێتە ئەستۆی منداڵەکانم، هیوادارم وەك وەفایەك بپارێزرێن..

٢٦/٤/٢٠٢١



ئەمڕۆژی ١٣/٦/٢٠٢١ زڕەی مۆبایلەکەم لێیدا، نواڕیم ژمارەیەکی نەناسبوو، وەڵامم نەیایەوە، بۆ دووەم جار لێییایەوە ئینجا وەڵامم یایەوە، یەکسەر وتی مامەندی قەمبەرە؟ وتم نەخێر قوربان حومبەری خەتەرە.. وتی بمانبوورە کاك حومبەر.. (زاراوەی پشدەری بوو)..

سواڵکەرێکی ناوبازاڕ، فانیلەی تیپی وەرزشی تۆپی پێی بەرشەلۆنەی لەبەرابوو بە ژمارە (١٠) دە، کە ژمارەی یاریزانی بەناوبانگ (میسی)یە.. بە برادەرانم وت بەداخەوە میسیش کەوتە سواڵ.. وتیان چۆن؟ شێوەکەم بۆ گێڕانەوە..

(میسی لە سلێمانی سواڵ ئەکات)!!

٢٠٢١/٤/٣



دوای ئەوەی ماڵە باوك گەورەیی نەما، بوو بە چۆڵەوانی، کە رۆژێ لە رۆژان جەی ئەهات لە میوانو رێواران.. بەڵام داخی گران کە سەیری سەربانو بنبانم ئەکرد هەر جریوەی چۆلەکەکانم ئەهاتە بەرگوێ، بەم تاکە شیعرە هەستم دەربڕی..

ئەی ماڵە چۆڵەکە،

بویتە لانەی چۆلەکە..

٢٠٢١/٥/٧



لە کاتێکا لەسەر گۆڕی یەکێ لە براکانم بووم، کەسێکی ناسیاومان هات، فاتیحای دایاو لەباتی ئەوەی بڵێ خوا عافویکا، وتی خوا لەیەکتان نەکا.. وتم قوربان تازە خوا لەیەکی کردووین و چاومان بەیەك ناکەوێتەوە..

٢٠٢١/٥/١٣



چالاکی هونەری، لە زنجیرە درامای "تازە باو"دا کە بریتیبوو لە سێ ئەڵقە، لە دەیا بەشداریم کرد، بۆ مانگی رەمەزان، لە کەناڵی کوردسات پەخشکرا، بە سپۆنسەری کۆڕەك تێلیکۆم، لە نووسینی نومێد کەمالو دەرهێنانی مەریوان نیبراهیم..

٢٠٢١/٥/٤



ئەمرۆژی ٢٠٢١/٥/١٩ گوێم لە راپۆرتەهەواڵێکبوو لە یەکێ لە کەناڵە ئاسمانییەکان، ئەوەی راگەیاند، کە لە شاری (بەسرە) دوو کەس لەسەر جێگای راگرتنی ئوتومبیلەکانیان بۆتە شەڕیان، هەریەکەیان سەر بە عەشیرەتێك بوون، ئەمەش بۆتە مایەی شەڕی نێوان هەردوو عەشیرەتەکە، بۆ ماوەی پێنج کاژێر شەڕ بەردەوامبووەو جۆرەها چەکیان بەکارهێناوەو کەسیش بریندار نەبووە.. وتم راپۆرتێکی زۆر ناماقووڵە، دیارە شەڕە ئاویان کردووە..

بەرۆشی..

دوای سەرنجدانم لە شەقامی پیرەمێردو گۆران، بەردەم بانقی رەشید.. دوو چاڵی تیابوو کە جێی سەرنجبوون، کەس خەمخۆری نەبوو، سەردانی بەرپرسی بانقم کردو بردمە سەر شوێنەکە.. زۆری پێناخۆشبوو، یەکسەر پەیوەندیمان کرد بە شارەوانییەوە، لایەنی بەرپرس دوای رۆژێك هاتن بە دەنگمانەوە.. بەرپرسی کارەکە ئەندازیار (بەکر)بوو جێی رێزە..

٢٠٢١/٥/٣٠



فولکەی بەردەرکی سەرای سلێمانی خاوەنی مێژووی شارەو ئەتوانم بڵێم دڵی شارەکەیە.. فەرامۆشییەکی زۆری پێوە دیارە لەرووی پاکوخاوێنیو سەوزاییەوە، بە داخەوە بۆتە جێگای سەگی بەرەڵاو منداڵە وردکەی عەرەب، بۆ شەرەشەقو تێهەڵدانی یەکتری.. بۆ ئەو مەبەستە پەیوەندیم کرد بە ئۆفیسی پۆلیسی هاتووچۆوە، تێمگەیاندن کە بە زووترین کات ئەبێ جێبەجێکرێو کاری پێویستی بۆ بکرێ.. وتی بەسەرچاو ئەیکەم بە راپۆرتو ئەیگەیەنمە شوێنی خۆی..

٢٠٢١/٥/٢٨



**هەرنج...**

بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧، رۆژی لەدایکبوونم وەکو زۆربەی هاوتەمەنەکانم بە ١/٧ی هەموو ساڵێك دەستیشان ئەکرێت..

٢٠٢١/٧/١



باخچەی دایك لە شەودا رووناکی کەمە، پەیوەندیم کرد بە بەرپرسی باخچەکەوە، تێمگەیاند، وتی زۆر راستە ئێمەش ئەوە ئەزانین، بەلاًم وەکو پێویست نایەن بە دەنگمانەوە.. منیش وەکو خەمخۆرێك پەیوەندیم کرد بە چەند کەسێکی دراوسێی باخچەکەوەو هاتن بەدەنگمەوە، وتیان هاوکارتانین، باخچەی هەموانە، ئەبێ مشووری بخۆین و ئەرکی سەرشانمانە..

٢٠٢١/٦/١



سەردانی یەکێ لە بازاڕەکانی شارم کرد، بەهۆی کارەکەمەوە بۆم دەرکەوت، کە دوکاندارەکان قسە لەگەڵ یەکتری ناکەن، منیش لای ئەو بەرێزەی کە نیشەکەم لایبوو وتم ئەم بازاڕە هەقبوو ناوی بنرێ بازاڕی ئاشتی و پێکەوەژیان.. وتی لەجێی خۆیدایە.. پێچەوانەکەشی راستە..

٢٠٢١/٦/٣



ئـەمڕۆژی ٢٠٢١/٦/٩، ریـورەسمی کردنـەوەی هـۆلی قوتابخانـەی مەلکەندی بنەڕەتی بەڕێوەچوو، بە ئامادەبوونی نوێنەری ئەنجوومـەنی پارێزگـاو هەندێ لە مامۆستایانو هونەرمەندانو هاوڕێیانی خۆشەویست، بەناوی منـەوە کرایەوە جێی ڕێزو ستایشو پێزانینمە، کە بۆ یەکەم جارە لە تەمەنما ڕێزی لەو شێوەیەم لێگیرابێو چەندین چەپکەگوڵی ڕێزم پێشکەشکرا.. بە وشەی جـوان رستەبارانکرام، هۆکارەکەی پەرۆشیمبوو بۆ قوتابخانەکە لە هەموو ڕوویەکەوە نزیکـەی بیـست سـاڵە لـە خزمـەتیانامو بەردەوامیـشم.. چـەند وێنەیـەکی یادگاریشمان گرت..

**تێبینی:** ئەبێ ڕۆڵی بەڕێوەبەری قوتابخانە خـاتوو گەشـاو بـەکر حەسـەنو پاریدەدەرەکەی خاتوو سـەیرانو مامۆستاو کارمەندان بە گشتی بەرز بنرخێنین، کە دڵسۆزی خۆیان نوواند بـۆ ئـەمکارە.. بـەوەش ئـەو ڕەچەیەیان شکاند کە خزمەتگوزاران پێش مـەرگیان بناسـرێن نـەك دوای مەرگ پێناسەبکرێن.. زۆر جـار وتـە بەنرخەکـەی نەجمـەدین مەلا ئەوتری: کورد زیندوو کوژی مردوو پەرستە!..



وتیان ئاغا لە نواندنا خۆت چۆن ئەبینیتەوە؟.

وتم نامەوێ سەیری خۆم بکەم...

٢٠٢١/٦/١٠

## ﴿ڕووداوو کارەسات!﴾

ڕۆژی ١٩٦٣/٦/٩ قەدەغــەی هاتووچــۆی شــاری ســلێمانی (منــع التجول)ەکەیە، کە حامیەی سلێمانی بووە گۆڕەپانی (گرتن‌و بردن‌و کوشتن)، کە قەت لەیاد ناکرێت، بە فەرمانی زەعیم سدیقی خوێنڕێژ، لیوای بیستی سەربازی..

ئەو کارەساتە بە (٩)ی نۆی حوزەیران ناوزەد دەکرێت..

٢٠٢١/٦/٩



ڕۆژانە کۆمەڵێك دەستەواژەی ڕێزم پێ ئەبەخشرێ لەلایەن ئەو کەسانەی کە سەردانم ئەکەن‌و سڵاوم ئاراستە ئەکەن..

بۆ نموونە ئەڵێن سڵاو ئاغای جوان.. ئاغای ڕێـز.. ئاغـای گـوڵ.. ئاغـای خۆشەویست، ... هتد. ئەبوایە کەسانی وەك ئێوە پەیکەری ئاڵتوونی بۆ بکرایە.. هەروەها ئەڵێن نموونەی شارێك.. شـار بـەئێوەوە جوانـە، ئێـوەش نـەمێنن شـار چۆڵەوانییە.. خوا بتانهێڵێ بۆ شارەکەمان‌و بۆ کوردستان.. ئەوەش گوزارشـت لە ڕێزو پێزانینی ئەو خەڵکـە ئـەکات، کـە زۆربـەی کـات وێنـەی یادگاریـشم لەگەڵ ئەگرن لە شـوێنە جیاوازەکانـەوە دێـن.. هـەمووی مایـەی دڵخۆشـی‌و پێزانینمە بۆ بەڕێزیان..

منیش هەر ئەوەندە ئەڵێم ئەگەر ئەوان نەبن من هیچ نیم!..

٢٠٢١/٦/١٨

ئەمڕۆژی ٢٠٢١/٦/٢٦ یادی هونەرمەندی گەورەی کورد، مامۆستای شیعرو گۆرانی حەسەن زیرەکی ئەمر کرایەوە لە کازیوەی سەرای سلێمانی کاتژمێر چواری عەسر، یەکێکبووم لە ئامادەبووان بۆ گەورەیی ئەو یادە..



یەکێ لە ئارەزووەکانم گەشتو گوزارە بۆ بینینو زانیاری زیاتر.. بەڕای من چەند ببینیت، ئەوەندە زاناترو رۆشنبیرتر ئەبیت.. لەوانەشە کەسانێك گەشتەکەیان جۆرێك بێت لە رابواردنی دیکەو هیچیتر، کە دوورم لێی.. تەمەنیش کە سەرکەوێ چێژی ژیانو گەشت کەم ئەبێتەوە.. بە خەیاڵی خۆم وای دائەنێم کە بۆ رابورادن بچمو یەکێك پرسیارم لێنەکا، ئەڵێ ئاغا بۆ گەشتێ ناکەی بۆ (بیلاڕوسیا) منیش وەك پیرێك وەڵامی ئەیەمەوە ئەڵێم کە پیاو (بیلا هەرامە)بوو بیلا روسیا دادی ئادا!...

٢٠٢١/٧/١



وتیان ئاغا خۆت کوتاوە؟

وتم پێویستم بە کوتان نییە، ژن کوتاومی..



ئەمرۆژی ٢٠٢١/٧/٧، لەسەر بانگهێشتی دەزگای مرۆیی مام وەك کەسایەتی شار ئامادەبووم بۆ کردنەوەی چاخانەی شەعب دوای نۆژەنکردنەوەی بەو شێوازەی، کە شایستەی بوو..

هەر کارێکی باش بۆ ئەم شارە بکرێ لەلایەن هەر کەسایەتیو لایەنێکەوە، جێی دەسخۆشییە..



دیمەنی ئاسكو گاکێویو هەندێ لە ئاژەڵانیتر پیشانەدرێ کە شێرو پڵنگو درەندەکانیتر رێگەیان پێنەگرنو پەلاماریان ئەدەن، بێئەوەی هیچ گوناهێکیان هەبێت. جاری وا هەیە نێچیرەکە خۆی فڕێ ئەداتە ناو ئاوێکەوە تیمساح پەلاماری ئەدات، خۆی لەویش رزگار ئەکات، دیسانەوە درەندەکانی سەر زەوی پەلاماریان ئەیەنەوەو ئەیانخۆن..

گەلە چەوساوەکانو میللەتە بێکەسەکان وەکو ئەو نێچیرانەیان لێهاتووە بەدەست دەسەڵاتی دڕندەی رۆژگارەوە..

مرۆڤەکانو ئاژەڵەکانو گیانلەبەران هەموو، پێویستیان بە ژیانی ئاسوودەو ئارامە..

٢٠٢١/٧/٣٠



ئەمڕۆژی ٢٠٢١/٧/٢٥، کاتژمێر شەشی ئێوارە سەردانی کەسایەتی پاکو بێگەردی شارەکەمان، کاك جەلالی عومەری ساماغامان کرد، لەگەڵ هاوڕێی خۆشەویستم سۆران نەبی عەبدولاّ، کە لە هەندەران هاتبۆوەو دۆستایەتی هەبوو لەگەڵ کاك جەلال. پێشوازییەکی ڕێزداریمان لێکراو میوانداریەکی جوانیان کردین، بە قاوە خواردنەوەو بەخشینی هەندێ کتێبو نامیلکە، کە گوزارشتی لە کەسایەتی بەڕێزیان نەکرد، ئەو کاتەی لە وەزیفەدابووە پلەی وەزیری پێبەخشرابوو وەك سەرۆکی دیوانی چاودێری دارایی.. بە مافی خۆی دوور لە حیزبایەتیو لایەنگیری.. چەند وێنەیەکی یادگاریشمان پێکەوە گرت.. باسەکانیشمان لەسەر کەسایەتی پلەداری پاکی وەك بەڕێزیان بوو، کە نموونە کەمو دەگمەنن لە نێو پلەدارانی ئەمڕۆدا، کە بەڕێزی ئێستا خانەنشینەو ماڵەکەی ئاوەلایە بەڕووی میواندا..

مرۆڤی پاك گەندەڵکار دژیەتی، لە کەسایەتی ئەم بەڕێزە ئەم چوارینەیەم هەڵێنجا..

مرۆڤ کە پاکبێ ناترسێ لە کەس
پاکی کەسێتی دوورە لە ناکەس
ئەبێ هەموو کەس پاکی پارێزبێ
هیچی پێناکرێ گەندەڵی تەرەس



ئەمڕۆژی ٢٠٢١/٨/٢، تۆفیقی حاجی باقی بەنگینە، ناسراو بە تۆفیق پاڵەوان دوا ماڵئاوایی لێکردین.. جێگای داخ و پەژارەیە کە سێیەمین پاڵەوانی شارەکەمانبوو دوای عەبدوڵا سەعیدو ئیسماعیل ئیبراهیمی پاڵەوان، جێمان ئەهێڵن، بەم پێیە کۆتایی بە پاڵەوانە دێرینەکانی شار هات، جێی خۆیەتی پرسەمان ئاراستەی کەسوکارو هاوڕێیانو دۆستانو شارەکەمان راگەیەنم.. دوا کۆستبێ..

کاك تۆفیق سەد ساڵ تەمەنی بەڕێکردو لە شۆفێرە یەکەمەکانی پاسی پۆڵۆنی بوو..



ئەمڕۆژی ٢٠٢١/٨/٧ هونەرمەندی دێرینی دەنگخۆشی کوردستان عومەر رەزا، دواماڵئاوایی لێکردین، کۆستێکی گەورەو گرانبوو، رۆحی شادو ئاسوودەبێت، خوای گەورە ئارامی دڵمان پێبەخشێ..



یەکێ لە برادەرەکانم وتی ئاغا ئەزانی فلانکەس مرد، خۆ ژنیشی نەبوو!. منیش وتم ئەگەر هەیبوایە زووتر ئەمرد..

٢٠٢١/٨/٨



ئــەمڕۆژی ۲۰۲۱/۸/۱، کۆچــی دوایــی خــانمی بــەڕێز (ســەبریە مەعروف)بوو لە تەمەنی (۹٦) نەوەدو شەش ساڵیدا، خێزانــی شــێخ حــسێنی سەعاتچی، لە گەڕەکی کارێزی ئەحمەد زەنگەنە، پشتی سەرای سـلێمانی، دوا خانمی گەڕەکەکەمانبوو، ئارەزووی بەخێوکردنی کەڵەشێرو مریشکی هــەبوو، هەمیشە دەنگی کەڵەشێرو گارەی مریشك لە ماڵیانبوو، بـەڵام بەداخــەوە بــە نەمانی خۆی ئەو دەنگانەش لە ماڵ براو چۆڵەوانی هێنایە کایەوەو وەك هەستی کۆمەڵایــەتی‌و دایکایــەتی خــانمێکی وا بــەڕێز، بــەم چــوارینەیە هەســتی خــۆم دەرئەبڕم..

نە دەنگ کەڵەشێر، نە گارەی مریشک
مـاڵ چـۆڵ‌و هـۆڵ بـوو بیـابـانی وشـک
مـاڵـی بـێ گــەورە وەک وێــرانـەیــە
گــۆڕەپـانـێکـە لەبـۆ جـرج‌و مشــک



کەسێکم چاك ئەناسی کە ساختەچی‌و دەستبڕە.. داوای قەرزی لێکردم.. پێموت بەداخەوە تەمەنی دانی قەرزم نەماوە تا لێتوەرگرمــەوە.. وتــی چــاکت پێکام.. وتم نیشانشکێنم، نزیکی هەشتام..

۲۰۲۱/۸/۲۸



ئەمڕۆژی ٢٠٢١/٨/١٦ دەنگۆی ئەوە هەبوو کە ڤایرۆسی کۆرۆنـا بـە شیوەیەکی بەرفراوان تەشـەنەی کـردووەو خـەڵکانێکی زۆر تووشـی بـوونو خەستەخانەکان جێگەیان نـەماوە.. بەنـدەش هەمیـشە ڕێنماییـە پزیـشکییەکان ڕەچاو ئەکەمو هەستام بە کڕینی دەمامك بۆ ئەوانەی کە سەردانی دوکانەکەم ئەکەن، یان ئاسیاوانو ڕێبواران دەمامکیان ئەیەمێ بۆ خۆپاریزی لەو ڤایرۆسو ئەخۆشییە ئەگریـسە وەك ئەرکی سەرشانم..



ئەمڕۆژی ٢٠٢١/٨/٢٠، دەنگۆی بـەربلاویو تەشـەنەی کۆرۆنـابوو، خەڵکانێکی زۆر پابەندی بەستنی دەمـامکبوون.. تووشـی یـەکێ لـە بـرادەرە هونەرمەندە خۆشەویستەکانم بووم، ئەویش کاك بـەکر مـستەفابوو، دەمـامکی نەبەستبوو، پێموت بۆچی دەمامکت نەبەستووە؟ وتی ئاغا سێ جار گرتوومە تۆ بلێی بیگرمەوە؟! وتم نایگریتەوە کۆرۆنا تەڵاقی یاویت، حەیای بێت نایەتـەوە بەلاتا..



**ولەیەك دەربارەی ژیانم..**

لێتان ناشارمەوە کە وەك مێروولەیەك بەدوای دەنکە گەنمێکا وێڵبووم بۆ بژێوی ژیان، دەنکەگەنم هێنایەبەرو گەیاندمە دەغڵو دووریمەوەو لە بەرەکەیم نەخوارد.. پێموایە کەسانێکی دیکەش هەن هاوشێوەمبن.. ئەڵێی چی ئەم ژیانە جۆرێکە لە سزای مرۆڤەکان ناهێڵێ بسرەوین، لە بێسرەوتیا بەرهەم ئەهێنن، کە جێی داخە ئەبن بە گاکەو کەر ئەیخوا، ئومێدەوارم مرۆڤەکان بە شێوەیەکی گونجاو لە ژیان بگەن، زیاد لە پێویست خۆیان نەرەنجێنن بۆ ئەوەی زیانی تەندروستی بەخۆیان نەگەیەنن.. ئاسوودەیی ژیان فەرامۆش نەکەن، مافی رەوای هەر تاکێکیشە هەوڵی بژێوی ژیانی بدا لە رێی رەواوە، دوور لە نارەوایی، زۆر بلاویش بێسرەوتی ئەهێنێتە کایەوە، پارووی زلیش قوتدانی زەحمەتە.. لەگەڵ رێزما...



**پیری..**

هاورێیەکی هاوتەمەنم هەواڵم پرسی.. وتم چۆنی؟ وتی ترم رژیوە، بۆ تسیش ئەنقێنم!!..

٢٠٢١/٨/٢٨



بە کەسێکیان ئەوت نێرەمووکە.. قسەخۆش و نوکتەباز.. تەماشام کرد لە دەنگدان نەهاتەوە، پەنجەی مۆرەکەی پێوەبوو.. پێموت نافەرین دەنگت داوە، دەنگی تۆ بە دوو دەنگ ئەچێ!!..

مانگی ٨ی ٢٠٢١



ئەمڕۆژی ٢٠٢١/١١/١٥، کاتژمێر (٢:٣٠) دوای نیوەڕۆ لە ئوتێل تایتانیك ئامادەبووم لەسەر بانگهێشتی ڕێکخراوی شار بۆ یادکردنەوەی شاری سلێمانی و بۆ دابەشکردنی ڕێزلێنان بۆ هەندێ لە کەسایەتییە خزمەتگوزارەکانی شار لە بوارەکانی هونەر و وەرزش و کۆمەڵایەتییەکان.. بەندەش وەك کەسایەتی شار بەشداربووم لە دابەشکردنەکەدا.

دەستخۆشیشم بۆ ئەو ڕێکخراوە کە بەو کارە پیرۆزە هەڵساوە، جێی ڕێزو ستایشە..



کەسێکی ناسیاومان دوامالئاوایی لێکردین، دوای سەرەخۆشی، پرسیم تەمەنی چەندبوو؟ وتیان نەوەدو یەك.. وتم ئەگەر سەدو یەك بوایە، ئەبو بە تەزبیح!!

٢٠٢١/١٠/١٨

**ئامۆژگاری.**

لە هەر کارێکا پەلە بکەی، لە هاوسەرگیریپا مەیکە.. بە گشتی زۆر جار پەلەکردنماڵوێرانی لەدوایە..

٢٠٢١/١٠/٢٠



**پایز.**

وەرزی پایزە، کۆکەو پژمینو سەرما بە گشتی بەهۆی گۆڕینی کەشوهەواوە مرۆڤەکان تووشی ئەبن.. بۆیە پێویستە پۆشتەیی خۆمان بپارێزین..

٢٠٢١/١٠/٢٨



سەر لە ئێوارەی رۆژی ٢٠٢١/١٠/٢٩ هەور گرمانیو یەکەم باران لە سلێمانی باری..



پیاو: ژنەکە دڵم تەنگە بە ئەرکی نەزانی ماچێکم بەرێ..

ژن: قورزەڵقورتت نەیەمێ..

پیاو: لەوەتەی هەیت دەرخواردت یاوم!

ژن: پیاو هەر ئەوەی قابیلە..

## یادەوەری باوکم..

هەندێ لە ژنە گوندنشینەکان گاڵتەو سوعبەتیان لەگەڵ باوکم هەبوو، پێیان ئەوت ئاغا سەروسەکوتت خواتەوە.. ئەویش ئەیوت مەڕوانە سەروسەکوتم، بڕوانە بەرو مێکوتم!

ئاماژەی بۆ منو براکانم ئەکرد، ئەیفەرموو ئەوانەش نموونەکەیەتی..

٢٠٢١/١٢/٢٧



لە کاتێکا هاوکاری کەسێکم کرد، لە رووی (مادی)یەوە.. وتی ئاغاگیان یاخوا دەست نەکەی بە گیرفانی خاڵیا.. وتم هەرچەند سەیری گیرفانم ئەکەم وا ئەزانم کە هی خۆم نییە..

٢٠٢٢/١/١٤



خەڵکانێکی زۆر کە سەردانم ئەکەن، ئەڵێن ئاغا گیان ئێوە نەمێنن، ئیتر دڵ بە کێ خۆشکەین؟!

گرنگی مرۆڤ لەودایە کە خۆشەویستی خەڵکی بێ..

٢٠٢٢/١/٢



## داخوازی وەسیەتنامە بۆ وەچەکانم.

داوام لێتانە بە هیچ جۆرێك جیاوازی نەکەن لە نێوانتانا، وەکو کوڕو کچ، بڵێن بە گوێرەی شەرع کوڕ دوو بەشەو کچ بەشێك.. شەرعی من یەکسانییەو جیاوازی نییە..

٢٠٢٢/٢/١٤



ئەمرۆژی ٢٠٢٢/٢/١٩، بەرگی شەشەمی کەشکۆڵەکەم بەخشی بە کەسێك، زۆر ستایشی کردم، وتی ئاغاگیان وا ئەزانم کیلۆیەك ئاڵتوونت پێبەخشیوم.. وتم بەڕێزم لە کیلۆ ئاڵتوونەکەیا رەنگە چاوچنۆکی تیابێ!، بەڵام لە بەخشینی کتێبا ئەوەی تیا نییە.. (وتراوە قەدری زێڕ لای زەڕەنگەرە)..



هەندێ جار کە هەواڵی کەسێك ئەپرسی لە بەرامبەرتا یا سڵاوی لێئەکەی، لە وەڵاما ئەڵێ (نۆکەرتم).. دیارە ئەمە بۆ رێزی بەرامبەرە.. بەڵام ئەگەر بیخەینە بواری نوکتەوە ئەڵێم نۆکەر خانچییەکی ئەوێت..

هەر مرۆڤێ رێزی خۆی بگرێ، نۆکەرایەتی کەس ناکات..

٢٠٢٢/٢/١٤



کەسێکم زۆر باش ئەناسی.. وتیان ئاغا چۆن پیاوێکە؟ وتم ئەوەی ئەیناسێ سلاوی لێ ئەکا...

٢٠٢١/١٢/٣٠



هاورێیەکم هەمیشە سکالای لە دۆخی خراپی خۆی ئەکردو نارازیبوونی دەرئەبڕی.. بۆ ئەوەی تۆزێ لە خەمی بڕەوێنمەوە، وتم با گەشتێکی دەرەوەی شار بکەین.. وتی هەزار جار.. کە چووینە دەرەوە ، بەرێکەوت نێرەکەرێك بەسەر ماکەرێکەوەبوو.. وتی خۆزگە ئەو ماکەرەبوومایەو مرۆڤ نەبوومایە.. منیش وتم نێرەکەرەکەش من بوومایە!!..

٢٠٢٢/٢/١٥



کەسێکی ئالوودە بە مەی، کە زیادەڕۆیی ئەکرد لە خواردنەوەیا.. پێموت شەوێك وەرە دەعوەتی منبە، حەزت لە چ مەیەکە سەرپشکبە.. وتی داوای لێبوردن ئەکەم من تەنها بە رۆژ ئەخۆمەوە!!..

٢٠٢٢/٢/١٦



**بۆ دوکاندارەکان.**

بۆ ئەوەی کڕیارت زۆربێ، گرانفرۆش مەبە، قازانجی زیاتر ئەکەیت..

٢٠٢٢/١/٢٦



لە هەشتاکانا فەرمانبەربووم لە بەڕێوەبەرایەتی چاودێری کۆمەڵایەتی، خانەی نەوجەوانان.. بەرپرسیارێتی کاری هونەری‌و سەرپەرشتیاری منالآنی (بێ باوك‌و کەس)م پێسپێردرابوو، باوکایەتییەکم لە ئەستۆیابوو، لە قوتابخانەش نەیانخوێندو ئامۆژگاریم ئەکردن، دوای نزیکەی سێ ساڵێك یەکێ لەو قوتابییانە هاتە دوکانەکەم، دوای سڵاو وتی مامۆستاگیان، هاتوومە خزمەتت.. وتم فەرموو لە خزمەتتام.. وتی هیچم ناوێ هاتووم دەستت ماچکەم.. ئامۆژگارییەکانی بەڕێزت منی کردووە بە مامۆستاو خاوەن ماڵ‌و حاڵی خۆم.. وتم ئەرکی سەرشانم بووە، منەتباری تیا نییە، سوپاست ئەکەم خواستی من بووە کە قوتابییەکان بە ئاستی کەسایەتی خۆیان بگەن، وەکو باوك بۆ وەچەکانی..



ئەمڕۆژی ٢٠٢٢/٢/٢٤، دوای هەواڵپرسین لە برادەرێکی هاوتەمەنم، لە سەروو حەفتاوە، وتم چۆنی لە چیای؟ وتی ئاغا گیان لە چیام؟ ترم رۆیوەو تسم ماوە.. وتم وریابە ژینگە پیسنەکەی..



ئەمڕۆژی ٢٠٢٢/٢/٢١، کە بە ڕۆژی زمانی جیهانی نـاوزەد دەکـرێ، لەسەر بانگێـشتی بەشـی زمـانی کـوردی زانکـۆی سـلێمانی ئامـادەبووم بـۆ سیمینارێك لە بارەی زمانەوە، کـە لــە لایـەن چـەند مامۆسـتای پرۆفیـسۆرو دکتۆرو ماستەرەوە سازکرابوو، بۆ توێژینـەوەی چـرووپری زمانەکـەمان، بـووە مایەی سەرنجی ئامادەبووان.. مامۆستاکان بریتیبوون لەم بەڕێزانە:

١- د. عەبدولجەبار مستەفا مارف (بەشی کوردی).

٢- د. گەشە عەبدولاّ عەلی (بەشی عەرەبی).

٣- د. ڕەئوف کەریم مەحمود (بەشی ئینگلیزی).

٤- د. شیلان عومەر حسێن (بەشی کوردی).

٥- م. غەریب ساڵح ساڵح (بەشی وەرگێڕان).

لە هۆڵی پرۆفیـسۆر (عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ)، بابەت (پاراستنی زمانی کوردیو بەهێزکردنی لە بەرامبەر هەژموونی زمانی دیکەدا).



لە هەڵسەنگاندنی کەسێکا، کـە لــە پەیوەنـدی کۆمەڵایـەتی دابڕابـوو، تەنهایی هەڵبژاردبوو، وتیان ئەوە چۆن کەسێکە؟ وتم کەسێکی بێگیانە!!.

٢٠٢٢/٢/٢٣



لــە ســاڵی (٢٠٠٧)دا خــەریکی خــانوو دروســتکردنبووم، کــاتی ســەقفتێکردن ئامێرێکیــان هێنــابوو پێیــان ئــەوت (خەباتــە)، چــیمەنتۆی تیــا ئەگێرایەوە، کە بریتیبوو لـە چـەوو لمو چـیمەنتۆ.. کرێکارەکـانیش کرێکـاری جەبلە، لـە کـاتی جەبلــە گرتنەوەکـەیا کریکـاری سـەر خەباتەکـە زوو زوو ئەڕۆیشت بۆ سەرئاو (توالێت)، کە نەئـەبوو نیـشەکەی بـەجێبهێڵێ.. منـیش هاتمە دەنگ لێیو وتم ئەرێ تۆ جەبلەگرەوەی یان گورگرەوە؟!!

٢٠٢٢/٢/٢٢



ناودارانی جیهان ئەوانەن کە لـە ژیـان گەیـشتوون، فەرموویانـە ئـەوەی ئەیبەخشی هی خۆتە.. ئەوەی کۆی ئەکەیتەوە بۆ خۆت نییە!!.

منــیش بــە قــەبارەی خــۆم ئــەو بۆچــوونەم رەچــاوکردووەو نکــوڵیم نەکردووە.

٢٠٢٢/٢/٢٨



ژن:  پیاوەکە هەموو ئازاو ئەنامم ژانەکا، ئەترسم بمرم..

پیاو:  ژنەکە هیچ ترسی ناوێ، دڵ لـە دڵ مەیە، هەتا من هەناسەبەم تۆ نامری..

٢٠٢٢/٣/٩



بۆ زانیاری خوێنەر و مرۆڤایەتی بە گشتی..

لە زاری (پیت هامیل)ەوە، کە پەیامنێری نیویۆرك بووە وتبووی:

بیرەوەری بە گەورەترین میراتی میرۆڤ هەژمار دەکرێت..

هیوادارم ئەو بۆچوونەم ڕەچاوکردبێت. ئەگەر مەرگم پێناخۆشبێ.
لەبەرئەوەیە لە خەڵك و خزمەت دائەبڕێم..

٢٠٢٢/٣/٥



لە کتێبی شۆربای مریشکا کە نووسینی (جاك کانفیلد)ە، لاپەڕە ١٧٤،
لە وتەی یەکێ لە شارەزایانی کۆمەڵناسیا هاتووە بە ناوی (مارك توین)،
فەرموویەتی (گاڵتەو گەپ گەورەترین نیعمەتی مرۆڤە)..

ڕەنگە من پێش ئەوەی ئەو وتراوە بێتە بەر دیدەم ڕەچاوم کردبێت..
نەخۆم و نەخەڵکیشم لەو نیعمەتە بێبەش نەکردووە..

٢٠٢٢/٣/٧



هەر کەسێ هەواڵم ئەپرسێ ئەڵێ ئاغا چۆنی لە چییای؟
ئەڵێم هەتا حەماڵیم بۆ بکرێ باشم..

٢٠٢٢/٣/٢٢

یەکێ لە هاورێ دێرینەکانم سکاڵای ئەوەی لا ئەکردم، کە ژنەکەی زۆر خراپەو هیلاکە بەدەستییەوە.. لەم رۆژانەیا بیستم ژنەکەی بە نەخۆشییەکی کتوپڕ دوامالٓئاوایی کردووە.. منیش سەردانم کردو سەرەخۆشیم لێکرد.. وتم نوخشەبێ لەو پیاوانەی کە بێزاری دەرئەبڕن لە دەست ژنەکانیان.. وتی ئامین..

پێچەوانەکەشی پیاوی خراپ دەرحەق ژنی چاك..

رۆژی ژنان ٨/٣/٢٠٢٢



ئەگەرچی باوەڕم بە فاڵو فاڵچییەکان نییە.. رۆژێك یەکێ لەو فاڵچییانە ئافرەتێکبوو بۆ ئەوەی شتێکم لێهەڵکرێنێ وتی با گرێی بەختت بۆ بکەمەوە.. وتم تازە ناکرێتەوەو بەختم سووتاوە، ئەسبابەکانیشم تەپاوەو داگیراوە.. وتی هیچت لێهەڵناکرێ مادام فەوتاوە، بچۆرە دواوە..

٩/٣/٢٠٢٢



ئەمڕۆژی ٢٠٢٢/٣/١٦ ساڵیادی کیمیابارانی شاری هەڵەبجەی بریندارو زامدارە، کە رۆحی پێنج هەزار مرۆڤی تیاچوو، بە هەزاران برینداری بەرکەوتەی لێکەوتەوە، کە جێی داخو پەژارەیە، دژی هەموو مرۆڤایەتیو مرۆڤی کورد، بە تایبەتی لەم رۆژەیا ئەبو هەموو کوردێك تەعزیبارو خەمباربێ.. بەڵام وەکو پێویست پەیڕەو ناکرێ، ئەبوایە پشووی فەرمی راگەیەنرایە، کەچی بەهۆی لەدایکبوونی کەسێك پشوو رادەگەیەنرێ.. جێی سەرنجە بەرەوڕووتانی ئەکەمەوە!..



گومانی تیا نییە چۆن لە ناو پیاوانا هەڵکەوتووی قسەخۆشو خۆش مەشرەفی هەیە، ئافرەتانیش هیچیان لە پیاوان کەمتر نییە، بەندەش بۆ دەمەتەقێ لەو جۆرە خوشكو ئافرەتانەم هەیە، ئەیانـدوێنمو ئەمدوێنن.. لەم رۆژانەیا یەکێك لەوانە سەردانی کردم، وتی ئاغا ئەوەندە چاومەگێڕە لەو دنیا حەفتاو حەوت حۆریتان ئەیەنێ!.. منیش وتم یەك حۆریم بەسە ئەویش تۆبی!...

٢٠٢٢/٣/١٧



بۆ مێژوو چەردەیەك لە کەسایەتیم یاداشت ئەکەم، نامەوێ بە شانو باڵو کەسایەتی خۆما هەڵدەم، هەرچیم کردووەو هەڵوێستم ئاراستەی پەرۆشیو بەتەنگەوەهاتنم بووە بۆ خاكو خەڵكو گەلەکەم، بە ئەرکی سەر شانم زانیوەو منەتی نییە.. رەنگە لەڕووی بەخششو بەتەنگەوەهاتنم ئەوەی لە تواناما بووبێت کردوومە لە ئاستی تاكو کۆیا، ئەو کارانەشم بە ئاستی خۆم زانیوە بۆ رەزامەندی دڵی خۆمو بەرامبەرەکەم، لە رۆژو مانگو ساڵا درێخیم نەکردووەو ناشیکەم، وەکو هەلێك بۆ دەرفەتی ژیان قۆستوومەتەوە مێژووەکەشم گەواهی ئەو راستیيەن، ئەمەکداری ئێوەش سەلمێنەرە بە سوپاسگوزاریمەوە.. داوای لێبوردنتان لێئەکەمو ئەوەم بە هی خۆم زانیوە کە بەخشیومە.. ماددەم کردووە بە قوربانی خۆم، خۆم نەکردووە بە قوربانی ماددەو کەسم نەڕەنجاندووە..

٢٠٢٢/٣/١٨



لە ناو ئێمەیا وا باروە، کەسێك کە لە تەمەنابێت، گۆڕانکارییەکی شێوەیی لێ رووبات‌و جوانتر بنوێنێ، پێیئەڵێن "گێڕێکت فەرق کردووە"، منیش بەهۆی کۆرۆناوە سمێڵم رووتایەوە، ناچار تاشیم.. برادەرێکم ئەوەی پێوتم‌و سوپاسم کرد.. وتم کوڕی باش گێڕی چی؟ من "مەکینەم داگیراوە"!..

٢٠٢٢/٣/١٠

**سەرنج..**

ئەو میراتییەی لە ماڵی باوکم بۆم ماوەتەوە بۆ بژێوی ژیانم بەکاریناهێنم، بەڵکو بە شێوەی مانگانە بە سەر کەسانی هەژارو نەدارا دابەشی ئەکەم، چونکە ئەوەی بەدەستی خۆم بەرهەمی ئەهێنم پێم ئەستەمە بۆ خۆم بەکاری بێنم..

٢٠٢٢/٣/١٨



**خۆزگە..**

خۆزگە پێش مەرگم بمتوانیایە هەرچیم هەیە بمبەخشیایە، تەنها پارەی کفن و دفنەکەم بمایە، هەموویم لە خزمەتی خاك و خەڵکەکەیدا بوایە..

٢٠٢٢/٣/٢٤



**بۆ زانیاری..**

هەر قوتابییەك کە روو ئەکاتە دووکانەکەم، لێی ئەپرسم لە قوتابخانەیا زیرەکی؟ کە ئەڵێ یەکەمم پێنووسێکی جۆری باشی پێشکەش ئەکەم..

٢٠٢٢/٥/١٣



لە ژیانما هەوڵی ئەوەم یاوە ئەم قەرزانە بدەمەوە..

* قەرزی خاك،
* قەرزی خەڵك،
* قەرزی خوا،
* قەرزی خۆمان (ماڵو منداڵ)..

٢٠٢٢/٤/٥

* * *

## کورسی..

ئەو کورسییەی لەبەر دوکانەکەما لەسەری دائەنیشم بۆ سلاوو هەواڵی ئەو خەڵکەی کە دڵم پەرۆشیانە، ئەتوانم ناوی بنێم کورسی بەخشینو بەتەنگەوەهاتن.. ئەوەی باوەڕم پێی بوویێو هانای بۆ هێنابم بۆ یارمەتیدان، کەم تا زۆر دڵی خۆمو خەڵکیشم نەڕەنجانووە.. بۆیە باسی ئەکەم، بەڵکو کورسی دەسەڵات چاوێك بە کورسی بێدەسەڵاتانا بخشێنیێو حەیا بیگرێ!..

٢٠٢٢/٤/٢٢

* * *

هەندێ لەدایك و باوکان، کە لە هەندەرانەوە ئەگەڕێنەوە بۆ کوردستان، بە زمانی ئەو وڵاتەی لێیبوون لەگەڵ منداڵەکانیان قسە ئەکەن.. منیش پێمناخۆشە.. پێنووسیان پێشکەش ئەکەم و پێیان ئەڵێم زمانو نووسینی دایکتان لەبیر نەچێ، ئێوە کوردن!!..

٢٠٢٢/٤/٥



## سلاڵاوێك..

| | |
|---|---|
| هەتاکو کوڕبووم | ئێجگار بەکوڕبووم |
| لە ئەقڵا سڕبووم | لە ورگا پڕبووم |
| لە ئەشقا مڕبووم | لە عەهدا زڕبووم |
| ئێستاکە پیرم | ماندوو زویرم |
| بۆ چەرمەسەری | ژیان خەبیرم |
| بەدەست ژنەوە | کۆت و زنجیرم |
| هەر بۆ گلەیی | ناچێ لە بیرم |

ئاغاو میدیا حسێن

٢٠٢٢/٤/١٩



سەر لە ئێوارەی رۆژی ٢٠٢٢/٤/٢٣، کاتی رۆشتنەوەی کاسبکاران، بە بەر کتێبخانەی شێخ رەزای تاڵەبانیا رۆشتم لەسەر شەقامی پیرەمێرد، شێخ حەسەن هەڵەبجەیی خاوەنی کتێبخانەکە زۆر دۆستمە، دوای سڵاو وتی ئاغا ئەمرۆ چوار کتێبم فرۆشتووە، سیانیان کەشکۆڵەکانی تۆوەیە!.. منیش وتم هیوادارم کەشکۆڵەکانمماڵەکان ئاوەدانکەنەوە، کەشکۆڵی میللەتەکەمەو هی من نییە..

تێبینی: تا ئێستا لە رووی مادییەوە دەسکەوتم نەبووە لە کتێبا، بەڵکو زۆربەیانم هەر بەخشیوەتەوە..



**لە بارەی نووانندنەوە**

ئەمەوێ ئەوە بخەمەڕوو بۆ مێژوو.. لە نوواندنا دوای تێگەیشتنم لە تێکستەکانو دەستەواژەکانو دەقەکان، جۆری نمایشەکەم ئەگرتە ئەستۆم، هەموو پێداویستییەکانم بەرجەستە ئەکرد، بێئەوەی بمە ئەرکو پێمەوە هیلاکبن، خۆم دەرهێنەری خۆم بووم، بۆ هەڵسەنگاندنی رۆڵی کەسایەتییەکانم، رەنگە بینەرو بیسەریش درکیان بەوە کردبێو بنە شایەتحاڵم.. لەگەڵ ڕێزما..

٢٠٢٢/٤/١٥



ئەمرۆژی ٢٠٢٢/٤/٢٦، ساڵیادی رۆژی نابیستان بوو لە پەیمانگای هیوای سەر بە بەڕێوەبەرایەتی چاودێری کۆمەڵایەتی.. منیش بانگهێشتکرابووم، قوتابیانو مامۆستایانو بەهرەمەندەکانیان پێشانگایەکی جوانیان فەراهەم کردبوو بەڕووی میوانانی پەیمانگاکەوە، شیاوی وتنە بە سوپاسەوە ئەرکی کردنەوەی پێشانگاکەیان خستە ئەستۆم، وەکو کەسێکی خەمخۆریان، بەدرێژایی ساڵانی خوێندنی پەیمانگا، گەرچی بەڕێوەبەری گشتی چاودێری کۆمەڵایەتیش ئامادەی مەراسیمەکەبوو.. سوپاسیان ئەکەم..



هاوڕێیەکی ئەفسەرم دەمێکبوو دیارنەبوو، دڵم کەوتبووە مەراقیەوە.. لەم رۆژانەدا پەیابوو، دوای رازو گلەیی وتی ئاغا گیان هیچ گلەیی مەکە (جەڵتە) لێیاوم.. وتم جەڵتەی چی تۆ لە سەر جێگای خەوتنیش چەکت پێیە چۆن لێیاوی؟!! ئەی ئێمەی قوڕبەسەر چی بکەین، کە بێچەکین؟!!

بۆ زانینتان، هەمیشە چەکی هەڵئەگرت، بە جلو بەرگی فەرمیەوە بوایە یان جلو بەرگی ئاسایی..

٢٠٢٢/٤/٢٧



کیژۆڵەیەکی تەمەن شەش ساڵان، کە لە پۆلی یەکی سەرەتایی وەرگیرابوو، لەگەڵ دایكو باوکی سەردانیان کردم، وەك نەریتی خۆی باوەشم پیا ئەکا وەکو باوكو دایکی خۆی.. منیش زۆرم خۆشئەوێ، هەندێ جار چاوم پڕ فرمێسك ئەبێو دڵم بۆی دائەخورپێ.. بەڵێنی ئەوەم یاوەتێ هەموو ساڵێك یەکەمبێو تا لە ژینام دیاری بۆ بکڕم..

ئەمڕۆ ڕێکەوتی ٢٠٢٢/٤/٢٧، دوای یەکەم ساڵی خوێندنی هات وتی مام ئاغا یەکەمی پۆلەکەمانم!.. وتم دەباشە با دیارەیەکەت پێشکەشکەم.. وتی با نمرەکانم بێنم ئەوسا دیاریەکەم بەرێ.. وتم باشە..

بەڵێنی زۆرم یاوە بە قوتابییە یەکەمەکان، کە دیارییان بۆ بکڕم...



ئەمڕۆژی ٢٠٢٢/٥/١٤ ژنو مێردێك هاتنە دوکانەکەم بۆ کڕینی هەندێ بەهارات، هەمیشە ژنەکان داخوازییەکان پێشکەش ئەکەن، لەبەر ئەوەی خۆیان خواردنەکە ئامادەئەکەنو ئەزانن چییان پێویستە.. وا ڕێکەوت پیاوەکە ناوی نەبەزبوو، بەڵام ژنەکەی دیاربوو (کۆنترۆڵ)ی کردبوو.. منیش بۆ پێکەنین بە ژنەکەم وت لەوە ئەچی کاك نەبەز هەر قاپەکان بشوات! وتی ئیشی پیاو هەر قاپشتنە.. وتم خوشکی بەرێز کاك نەبەزت بەزاندووە.. وتی ئاغا گیان هەموو نەبەزەکان لە ئاستی ژنا بەزیون.. وتم کاك نەبەز خۆ نەبەزیوی؟ وتی بۆ من پیاو نیم؟!

خانوویەکم هەیە لـە بـەکرەجۆ، ڕێکخـراوی (UNHCR)ی تیـابوو، چۆڵیانکرد، منیش بڕیارم یاوە کە نەیدەم بە کرێ، لەگەڵ ئەوەشـا کـە چـەند شوێنێك روویان لێنام.. بەڵام هەر نەمداوە بە کرێ، ئەگەرچی کرێـی باشـیان ئەیامێ، هەر لەسەر بڕیاری خـۆمم، ڕووبـەری خانووەکـە بـە زەوییەکانیـەوە نزیکەی (١٠٠٠) هەزار مەتر دووجا زیاترە..

شیاوی وتنە ڕێکخراوێکی تورکی هـاتن وتیـان چـەند ئـەڵێی ئامـادەین، بەهۆی چەند کوردێکەوە، وتم برادەرینە ئەوان باوەڕیان بە کورد نیـیە، منـیش باوەڕم پێیان نییەو هیچ گرێبەستێکیان لەگەڵ ناکەم..

٢٠٢٢/٤/٤



شەوی ٩ لەسەر ٢٠٢٢/٥/١٠، لە دەمەو بەیانیا ئـەم خـەوەم بینـی.. ماڵی بـاوکم باڵەخانەیـەکی دوقـاتبوو، شـێوەیەکی کلتـووریو کەلـەپووری هەبوو، بە هەموو پێداویستییەکانیەوە شیاوی خزمەتگوزاری ئەدەبیو هونەریو کۆمەڵایەتی بوو.. بە گشتی خەڵکانێکی زۆریش لـەوێبوون..هـەر کەسـە ڕاو سەرنجی خۆی دەرئەبڕی، کە فلان گۆرانیبێـژو فـلان ئـەدیب ئـەتوانن کـاری خۆیانی تیا ئەنجام بدەن.. بەڵام سەقفی خانووەکە پێویستی بە چاککردن هەبوو، بەڵێنی چاککردنیم داو وتم تا ماوم ئەبم بە (زێـوان)ی ئـەم خـانووەو هەرچـی داهاتێکی هەبێت من لێی بێبەریمو هیچم لێی ناوێ..



**راسپێری هەمیشەیی..**

تکایە ئەگەر مردم، کەلوپەلـەکانم کـە کـاری هونـەریم پێـوەکردوون، لەگـەڵ کەشـکۆڵەکانم مەیانفـەوتێنن، چـی دۆکـۆمێنتم هەیـە لـە شـوێنێکی دیـاریکراو ئەگـەر خانووەکـەی بـەکرەجۆشبێ باشـتر تیـا بپـارێزن، وەکـو مۆزەخانەیەك گەشتیارانو میوانـان رووی تێبکـەن، ئەگـەر سـوودی مادیـشی هەبێت، با بۆ بەرژەوەندی گشتی بێت.. نموونـەی منـاڵانی بـێ سەرپەرشـتیار، خانەی نەوجەوانانی کوڕانو کچان، خاوەن پێداویستی تایبـەت، هـەموو ئـەو شوێنانەی پێویستیان بە خزمـەت هـەبێو شـایەنییو کارمەندانیـشی خزمـەت بکرێن وەکو پێویست بۆ بەرێکردنی کارگێڕی.. لەناو هاردەکـەشما زۆر شـتی تۆمارکراوم هەیە بۆ ئەوەی لە فەوتان رزگاریانبێ، دەتوانرێ کاری هونـەریو ئەدەبی کۆڕو سیمینارو بابەتی سینەماو شانۆشی تیا بگێڕدرێ..

شوێنەکەش هەر بەناومەوەبێ وەك مافی خۆم...

٢٠٢٢/٢/١٢



وتراوە هونەر لە سیاسەت گەورەترە.. واتە هەر هونەرمەندێك چـووبێتە نـاو ئـەم سیاسـییە چەواشـەکارانەوە لـە ئاسـتی کەسـایەتیو هونەرەکـەی دابەزاندووە!..

٢٠٢٢/٥/٢٠



لە کاتێکا کە نەخۆشبووم لە خەستەخانە، ڕێگەیان پێدام کە بچمەوە ماڵەوە، زۆربەی ئازیزانو دۆستان چەپکەگوڵی سروشتییان بۆ هێنام، جێگە نەمابوو تیا داینێم.. دیاربوو ئەو گوڵانە بۆ گەشانەوەی تەندروستیمبوو، خۆیان ڕوویان لە سیسبوون نەکرد.. بەڵام لە دڵی خۆما دیارییەکی گەشاوەی هەمیشەیی بوو.. جێی ڕێزو پێزانینمە..

یەکێ لەو هاوڕێ خۆشەویستانەم شێرکۆ فارس بوو، کە کۆچی دوایی کرد، بە داخەوە نەمتوانی دوای تەرمەکەی کەوم بۆ گۆڕستان..

٢٠٢٢/٥/١٩



ئەمڕۆژی ٢٠٢٢/٥/٢٣، ئافرەتێکی زۆر قەڵەو هاتە دوکانەکەم، دوای سلاو وتی ئاغا گیان دەرمانی زەعیفیتان نییە؟ هەرچی ئەخۆم قەڵەوم ئەکا.. منیش وتم خوشکی بەڕێز باشترین ئەوەیە هەندێ مەشقی وەرزشی بکەی.. وتی تاقەتم نییە.. وتم دە بە مێردەکەت بڵێ ڕۆژانە ڕاوتنێ.. وتی جا کوا ئەو غیرەتەی هەبوایە منی ڕاونایە!!..



لە ناو کوردا مرۆڤە خزمەتگوزارە دەگمەنەکان لە ژیانیاندا بە ناسۆری سەرئەنێنەوە.. لە دوای مەرگیان پێناسەو هەڵسەنگاندنیان بۆ ئەکرێ.

٢٠٢٢/٥/٢٣

## پەرۆشی..

هەر ئەمەوێ هێزو گوڕ بەمە بەرخۆم، دەسبەمە پێنووسەکەمو پەرۆشییەکانم تۆمارکەم، بەڵام ناوێرم نەبا خوێنەری بەڕێز بە جۆرێکیتر لێم تێبگا.. هێندە هەیە نەبێت کاری باش تۆماربکرێو بخرێتەڕوو، هەر هیچ نەبێ کەسانی دیکەش هەستیان ببزوێو رەچاویکەن.. رێگە بفەرموون کە بڵێم ئەوەی لەدەستم هاتبێ بۆ خزمەتی هەر شوێنێكو کەسێك، کە پێویستی بە یارمەتی بووبێ نکوولێم نەکردووە، هەر ئەو کارانەش بووە کە ئارامی بە دڵم بەخشیوەو رێزی بۆ فەراهەم کردووم، بۆیە لێم مەگرن بەم چەند رستەیە گوزارشتم لە کەسایەتیم کردووە، لێبووردنی ئێوەش پاداشتمە، رۆژگاریش دادوەرە..

٢٠٢٢/٥/٢٧



## یاد..

لەو باوەڕەدام دوای کۆچیدواییم، خەڵکانێکی زۆر خەمم بۆ ئەخۆن، لەبەر ئەوەی لە ژیانما خەمخۆریان بووم..

٢٠٢٢/٦/١١



**بەداخەوە..**

ڕۆژێك تێکەوتووین حکومەت بازرگانە بەسەر میللەتـەوە، پزیـشك بـە سەر نەخۆشەوە، مامۆستا بەسەر قوتابییەوە، .....

٢٠٢٢/٦/١٢



کەسێك هاتە دوکانەکەم، دوای سڵاو وتی مام ئاغا من خـەڵکی کـانی بەردینەم، هەموومان تۆمان زۆر خۆشەوی.. منیش وەڵامم دایەوەو وتم سوپاسی هەمووتان ئەکەمو خۆشمئەوێن، وەك کانی، هەمیشە پڕ ئاوبن، وێنەی بـەردیش بەهێزبن..

٢٠٢٢/٥/٢٥



لە نێو بـازاڕا کەسـێك بەچـکە مـەیموونێکی پێـوو، لەسـەر شـانوملی هەڵـەزو دابەزی ئەکردو هەڵئەزنا پیایـ.. برادەرێـك وتـی ئاغـا سـەیری ئـەو مەیموونەکە ماشەڵا چەند جوانە؟! وتم بـرادەر مـەیمون ناوبـانگی بـە ناشـرینی دەرکردووە.. یەکێ خۆی مەیموون نەبێ ماشەڵا لە مەیموون ناکا!..

٢٠٢٢/٦/٢٧



سەر لـە ئێوارەی ئـەمڕۆژی ٢٠٢٢/٦/٢٢ سـاڵیادی کۆچـی دوایـی هونەرمەندی گۆرانیبێژی رەسەنی کوردی، عوسمان عەلی بوو، کـە لـە هـۆڵی رەمـادە لەلایـەن تیپـی مـوزیکی سـلێمانییەوە سـازکرابوو، بـە ئامـادەبوونی کەسـانێکی زۆر لـە هونەرمەنـدانو هـەوادارانو هاوڕێـیانو کەسـوکاری هونەرمەند.. کتێبێکی شایستە بە ناونیشانی رەهەندەکانی هونەرمەند لە لایـەن مامۆستای مۆزیك عادل حەمە کەریمەوە ئامادەکرابوو بە ژمارەیـەکی زۆر، لـە دوای مەراسیمەکە دابەشکرا بەسەر ئامادەبوواندا، کە بریتیبوو لە گەشتێك بە بەرهەمـە هونەرییـەکانی (عوسمـان عـەلی)دا، هـەروەها گوزارشـتی لـە ژیـانی هونەرمەند ئەکرد.. جێگای دەستخۆشییە بۆ ئەو مامۆستا بەڕێزو وەفادارە..



**شانازی..**

بەوەوە ئەکەم کە لەم بوارانەی خوارەوەدا سەرکەوتنم بەدەستهێنابێ..

- کۆمەڵایەتی،
- هونەری،
- ئەدەبی،
- رۆشنبیری..

٢٠٢٢/٦/٢٥

**بۆ مێژوو..**

هەرچیم خستۆتە سەر کاغەز زادەی ژیانی رۆژانەی خۆمە.. هەڵقوڵاوی ناخی خۆمە، هەوڵیشم یاوە لاساییکردنەوەی تیا نەبێ و رەنگدانەوەی دیدو بۆچوونی خودی خۆمبێ بە دڵنیاییەوە..

٢٠٢٢/٧/٦



ئەمرۆژی ٢٠٢٢/٧/٧، کە رۆژی عارفەی پێش جەژنی قوربان ئەکات، لە ناوجەرگەی بازاڕا چاوم بە دادوەریکی بەرێزی هاورێم کەوت، بە هەردوو دەستیەوە دوو عەلاگەی پڕ شتومەکی پێبوو، دیاربوو ئەیویست خۆی بگەیەنێتە ئوتومبێلەکەی.. لە سیمایا هیلاکییەکی زۆری پێوە دیاربوو.. دوای سلاو وتم جەناب پشوویەك بە، با پرسیارێکت لێبکەم.. وتی فەرموو. وتم ئەم بارگرانییەی بەرێزت بێدادی نییە؟ قابیلی ئەوە نییە دەعوایە تۆمارکەیت؟ وتی دادوەرەکەی من خێزانەکەمە، کێ ئەتوانێ بیداتە دادگا؟! وتم دە کەواتە مافی خۆتە..

دادوەری باری کەسێتیبوو..



رۆژێك ژنێکی ئاسیاوماندو منداڵەکەی سەردانیان کردین لە ماڵەوە.. دوای سڵاوو بەخێرهاتن و پشوویەکی کەم، بۆم دەرکەوت منداڵەکەی زۆر عەجوول و نارەحەتبوو، بەدارو بەردا هەڵئەزنی و منیش و ژنەکەشم زۆرمان پێناخۆشبوو.. لە رووشمان نەئەهات هیچ بڵێین.. دایکەکەشی دەنگی نەئەکرد. وەڵا منیش وتم خوشکێ ئەم منداڵە ناوی چییە؟ وتی ئارام!.. وتم ئەی بۆ ناوەکەی ناگۆڕی؟ وتی ناوێکی کوردی خۆشە.. وتم راستەکەیت، بەڵام بیکە بە نەسرەوت، هەر کوردیەو خوشە.. وتی بۆچی؟ وتم لەبەر ئەوەی بۆ چرکە ساتێکیش ئارامیم تیا بەدی نەکرد!.. دوای تێڕامانێك وتی ئەشهەدو پڕ بە پێستێتی..

٢٠٢٢/٧/٢٨



بەندە دوکانی بەهاراتم هەیە، هەندێ لە دراوسێ دوکانەکانیشم هەمان پیشەیان هەیە.. کەسێك هەیە زۆربەی جار داوای یارمەتیم لێئەکات.. منیش دەست نانێم بە روویەوە.. کە سەرنجیش ئەیەم بە یارمەتییەکەم ئەچێ بەهارت لە دەرو دراوسێکانم ئەکڕێ.. منیش ئەمدایە رووی.. بەڵام پێموت ئەگەر بەهاراتیشت ویست بێدڵێت ناکەم داوا بکە!!

٢٠٢٢/٨/٤



سلاڵای ئەمەن..

جێی داخە، کە لە ناو خێزانما کەسێکی وا شك نابەم، کە جێگەم بگرێتەوەو درێژە بە ژیانی دوای مەرگم بداو رێچکەم بگرێ..

٢٠٢٢/٧/٢٨



ئەمرۆژی ٢٠٢٢/٧/٣١ لە بینای ئەمنە سوورەکە پێشانگای (سیناتۆری مافورگەری) لەلایەن بەرێز مامۆستا تۆفیق سەعید محەمەد ئامادەکرابوو، کە توانیبووی چەند تابلۆیەکی فەرشچنین بە قەبارەی بچووك نمایش بکات.. کە بووە جێی سەرنجی ئامادەبووانو گوزارشتی لە هونەری چنین ئەکرد.. شیاوی وتنە تابلۆکان بۆ فرۆشتنو سوودەکەشی بۆ کۆمەڵەی نابینایان بوو.. رێزی کردنەوەی پێشانگاکەش بە بەندە سپێردرا...



وتیان ئاغا نەوت گرانبووە، ئەم زستانە چی بکەین؟!!

وتم هەموو باوەشنەکەین بەیەکا، مەگەر گرانبوونی نەوت کۆمانکاتەوەو یەکمانخا..

٢٠٢٢/٨/١٥

لە ئاخاوتنا خەڵکانێك هەن وەکو پێویست ماف نادەن بە وشە، بەڵام مرۆڤەکان لە مەبەستیان ئەگەن.. بۆ نموونە: بە (جومعە) ئەڵێن (جوعمە)، ربع – رعب، یوسف – ویسف، .... هتد..

لە مەراسیمێکی ژنو ژنخوازیا منو کەسێکی هاوتەمەنمیان دەستنیشانکرد بۆ شاهێدی مارەبڕینەکە.. مامۆستا بە کوڕەکەی ئەوت بڵێ وا خۆم ئینکاح کرد.لە فلانی کچی فلان لەسەر مەزهەبی فلانی، بە مارەیی پێشەکی ئەوەندەو پاشەکی ئەوەندە مسقاڵ ئاڵتون.. کوڕەش لە باتی ئەوەی بڵێ ئینکاح ئەیوت نیکناح.. چەند جار مامۆستا لێی دووبارە ئەکردەوە، هەر ئەیوت نیکناح،.. منیشو شاهیدەکەی تریش درکمان بەوەکردبوو.. ناچار بە مامۆستام وت ئێمە شاهیدی لەسەر کامیان بەین؟ (ئینکاح)ەکە یان (ئیکناح)ەکە؟ فەرمووی هەردوکی ئەبێ.. (إنما الاعمال بالنیات).. واتە (نیەتی دڵ کاری خۆی ئەکا).. شاهیدی خۆمانمان دا..

٢٠٢٢/٨/٧



ئەمڕۆ ٢٠٢٢/٨/١٥ هاورێیەکم سەردانی کردم، رۆژێکی زۆر گەرمبوو، چلەی هاوین، هەروا دوورەپەرێز سڵاوی کرد، دوای سڵاو وتم بەرێز وەرە پێشەوە.. وتی هەموو گیانم ئارەقە.. وتم خوایەکرد ویسکیو شەرابەبوو، گوێ مەیەرێ..

لە مێژبوو فرمێسک لەچاوما قەتیس مابوو،هەلێکی بۆ نەئەڕەخسا بەخوڕ بێتە خوارەوە، چی ئاسۆرو دەردی دڵە لەگەڵ خۆیا راپێچیکا.. سوپاس بۆ رۆژگاری ئەمرۆ رێکەوتی ٦/٨/٢٠٢٢، خوشکێکی دڵ پڕ لە داخ لە هەندەرانەوە هاتبووەوە، فەرمووی چل ساڵە نەگەڕاوومەتەوە بە جۆرێك دەستی کردە ملمو ماچیکردم، وەکو ئەو ماوە زۆرە دڵی لای من بووبێ.. وتی ئۆخەی ئاغاگیان چاوم پێتکەوتەوە، خوڕخوڕ فرمێسکیش لە چاوەکانیا ئەباری، فرمێسکەکانی منیشی تێکەڵاو فرمێسکی خۆی کرد، وێنەی یادگاریشمان پێکەوە گرت، پێنووسەکەم کە هەمیشە هاوڕێمە پێشکەشم کرد.. پێمووت نووسینو ئاخاوتنی کوردی لەبیر مەکەن بەهۆی ئاوارەییەوە.. فەرمووی لەخۆم نەگۆڕاوم هەزار ساڵ لە غەریبی بم..

لەسەر کورسی بەر دوکانەکەم دانیشتبووم، وتی دڵنیا نەبووم کە لێرەیت.. ئەبوایە دیارییەکم بۆ بهێنایتایە.. وتم جوانترین دیاریت بۆ هێناوم، هەرچی داخو حەسرەتی دڵە لەڕێی فرمێسکەوە هەڵمژشت..



هەر کاتێك سەردانی باخچەی دایك ئەکەم، ئارەزووی ئەوە ئەکەم لە ژێر سێبەری ئەو دارانەیابم کە خۆم رووانوومن..



ئەمڕۆژی ٢٠٢٢/٨/١٢ سەردانی شاری قەڵادزێمانکرد لەسەر داوای کوڕەلاوی قەڵادزێ، ئالی قادر پشدەری، لەدایکبووی وڵاتی ئەڵمانیا.. وەکو هەڵوێستێکی جوامێرانە چەند هونەرمەندو کەسایەتی شاری سلێمانی بانگێشتکردبوو بۆ هۆڵی شانۆی شارەکەیان، کە باسی کاری هونەریو فەرامۆشکردنی دەڤەرەکەیان لە هەوڵی بووژاندنەوەو برەودان بە دەڤەرەکەیان، لەلایەن دەسەڵاتەوە، ئەگەرچی خاوەنی کۆمەڵێ هونەرمەندو ئەدیبو رۆشنبیرن.. ئێمەش وەك بەشداربوو لە کۆڕەکەدا هەریەك بە وتەی خۆی ئامادەیی هاوکاریمان پیشاندا، کە بریتیبووین لەم بەڕێزانە:

١- عومەری کەریم ئاغا.
٢- بەهادین نوری.
٣- کامل حەمە ئەمین.
٤- ئومێد عەلی مەرهوم.
٥- فەرەیدون محەمەد سالح.
٦- ئومێد کەمال.
٧- بێگەرد خان.
٨- کاوان کەریم.

کۆڕەکەش لە هۆڵی رۆشنبیری قەڵادزێ سازکرا، بە ئامادەبوونی قایمقامو بەرپرسی رۆشنبیریو ئەدەبیو چەند کەسایەتییەکی شارەکە..

هاورێیەکی دێرین‌و خۆشەویستم هەیە لە هەولێر، پەیوەندیم پێوەکرد بۆ هەواڵپرسین‌و لە دەرفەتێکا بتوانم سەردانی بکەم.. وتم وەزعتان چۆنە؟ لە چیان؟ وتی وەزعی چی ئاغا گیان زۆر بێ ئاوین.. وتم عەیب نەبێ کەی ئاوتان هاتەوە ئەو کاتە سەردانتان ئەکەم...



لەدوای راپەڕینەوە چەندین کۆمەڵەو رێکخراوو حیزب‌و حیزبۆکە هاتوونەتە ئاراوە، هەریەکە لەوانە گوزارشت لە ئاست‌و سەنگی خۆی ئەکات، بەڵام بەندە کۆمەڵەیەك ئەهێنمە ئاراوە گوزارشت لە داخ‌و پەژارەی کەسانێك ئەکات، کە کاتی خۆی پڕو چڕو بەهێزبوون، بەڵام داخەکەم ئێستا لەدەستیان داوە وەك پیاو...

ئەمڕۆ رێکەوتی ٢٠٢٢/٨/٩ لەگەڵ چەند هاورێیەکی هاوتەمەن‌و دۆستم وێنەیەکمان چرکاند، وتیان ئاغا رات چییە بەرامبەر ئەم وێنەیە؟ چی لەژێریا ئەنووسی؟.. وتم وێنەیەکی زۆر پیرۆزە ئەنووسم ئەندامانی کۆمەڵەی بێکێرانی کوردستان.. لەڕاستەوە (بێکێر فلانی کوڕی فلان، .... تا کۆتاکەسی)، هەر بەو شێوەیە.. وتیان ئاغا جێی خۆیەتی کە شەرەفی ئەندامێتیت پێ بەخشین.. بەڵام ئەبێ کەسێك پەیداکەین بۆ سەرۆکی کۆمەڵەکە..

تێبینی: تەمەنەکان لە نزیکی هەشتایا ئەبوون..

خەڵکانێکی زۆر کە لە دوورەوڵاتەوە ئەگەڕێنەوە یـان لـە مێـژە منیـان نەدیوەو بیرم ئەکەن، کە سەردانم ئەکەن دەست ئەکەنە ملمو ماچـم ئەکـەن، بەرێکەوت چەند کەسێك پێکـەوەهاتن بـەو جـۆرە رەفتاریـانکرد، یـەکێ لـە شاگردەکانم وتی مام ئاغا مەیەڵە ماچتکەن، نەخۆشی لە ئارادایە.. وتم ئـەوەی من ماچئەکا تەندروستە، خۆ ئەگەر پێچەوانەکەشیبێ ئەو کاتە ئەبم بە دژەمـاچ وەك دژە تیرۆر..

٢٠٢٢/٨/١٦



گومانی تیا نییە هەندێ دیاردەی دەروونی لە ژنانو پیاوانا هەیە، کە بـە دڵپیسـی ئەدرێتە قەڵەم.. لێرەیا مەبەستم لە خـودی خێزانەکـەی خۆمـە، کـە تەمەنمان حەفتای تێپەڕانووە.. بەڵام جێی داخە کە لە هیـچا نـەماوم.. خۆشـی باش ئەزانێو ئەمناسێ.. کەچی هەر لە ماڵ یەمە دەرەوە خێرا پەیوەنـدیم پێـوە ئەکاو لێمئەپرسێتەوەو دڵی لێم پیسـە.. ناچار وتم ژنەکە من بە گـەنجی هیـچم نەکردووە، ئەتەوێ بە پیری دڵم لێپیسکەی؟!! بمخەرە حەمامی ژنانەوە دەستم بۆ ناوەشێنرێ.. من شەیتان دەستی لێهەڵگرتووم، تۆ بۆ دەستم لێهـەڵناگری؟! ئەڵێ پیاو ئامانی نییە.. وتم خۆزگە ئەمبوایە!!..

٢٠٢٢/٨/٢٣



## یادێکی دڵتەزێن..

ئەمڕۆژی ٢٠٢٢/٨/١٢ بـە کارەسـاتێکی دڵتـەزێن کـە بریتیبـوو لـە ڕووداوی هاتووچۆ، کچی گەرەکەکـەمانو خـانمی شـارەکەم نیگـاری حەمـە غەریبی حاجی ساڵحی زەریفیێ، کە هاوژینی مامۆستای بـەڕێز فـەوزی ڕەمـزی مەلا مارف بوو، ماڵـاوایی لێکـردین، کۆسـتێکی گـەورەو گرانبـوو، خـوای گەورە سەبووریمان باتو جێگای بەهەشت بێت..



ئـەمڕۆژی ٢٠٢٢/٨/٢٧ پەیوەنـدیم کـرد بـە هاوڕێیەکمـەوە بـۆ هەواڵپرسین، کە باری تەندروستی ناجێگیربوو، وتـی ئاغـا گیـان زۆر سـوپاس باشم.. وتم نەوچاتر.. لە هەمان کاتا هەواڵی کەسێکیترم لێپرسی کە ناسـیاوی هەردوکمان بوو، لـە ئێمـە بەتەمـەنتربوو، هەشـتا بـەرەوژووربوو، وتـی ئـەو فلانکەسە گوێی گرانبووە.. وتم مادام گـوێی گرانبـووە ئەسـبابەکانی هـەرزان بووە! دایە قاقای پێکەنین، وتی ئاغا گیان ڕێك وایە.. وتم پێکەنینیش بۆ مرۆڤـ شیفایە..

٢٠٢٢/٨/٢٧



بەداخەوە لە ناو ئێمەیا خەریکە ئەبێتە نەریت‌و باو، بۆ بڵاوکردنەوەی کۆچی دوایی هەندێ کەسایەتی دیاری ناو کۆمەڵی کوردەواری جێی سەرنج‌و تێڕامانە بۆ ئەو جۆرە مرۆڤانە، کە خەمبەخشی دڵی زۆرینەن، کەسانی ناو کۆمەڵگان، بە هەڵوێستی جوان‌و جوامێرانەیان..

ئەمڕۆ ٢٠٢٢/٨/٢٤ لە نێو (فەیسبوک)دا کۆچی دوایی هاوڕێم محەمەد مەردانیان ڕاگەیاند، کە سەرۆکی کۆمەڵەی کەلەپوورە.. ئەوەش هەر لەبەر لایک‌و کۆمێنت بۆ پەیجەکانیان.. کە بووە مایەی دڵنیگەرانیم.. یەکسەر پەیوەندیم پێوەکرد، بەم شێوەیە: سڵاو لە برای کۆچکردووم.. ئەویش سڵاوی خۆی ئاراستەم کردو وتی سڵاو لە برای زیندووم.. وتم حەمە گیان سوپاس بۆ خوا ماوی؟! وتی لە رقی ناحەزان هەر ئەمێنم!!.

٢٠٢٢/٨/٢٥



## یادێکی تاڵ..

ئەمڕۆژی ٢٠٢٢/٨/١٨، قوتابخانەکەی کەشتی نوحی نەجمەدین مەلا، لە سابوونکەران، کە زیاد لە حەوت هەزار نەخوێندەواری تیا فێری خوێندەواری کرا، خرایە بەر کێلەی شۆفڵ‌و رووخێنرا.. جێی داخ‌و کەسەرو پەژارەیە، داخێکی تریش بە دڵی سلێمانیا چزا.. ئەمەیە پاداشتی شاری رۆشنبیری، کە باس ئەکرا؟!!

دوای ئەوەی چەند جارێك مرانیانمو نەمردبووم، هاوڕێی بەڕێزم محەمەد مەردان سەرۆکی کۆمەڵەی کەلەپوور، چەند جارێك زەنگی بۆ لێیام، بۆ زانینی هەواڵی مانو نەمانم.. لە سێیەمجارا بە دەنگێکی نزمەوە وەڵامم دایەوە.. وتی ئاغا نوخەی ماوی.. بەڵام دەنگت بۆ وا کزە؟ وتم قوربان لە ناو گۆڕەوە قسەت لەگەڵ ئەکەم..

٢٠٢٢/٨/٢٤



ژنێکی بەڕێز لە هاوسەرەکەی جیابوبۆوە، ناسیاوی من بوون، لەم نیوەندەیا باوکی مێردەکەی، واتە خەزووری کۆچیکردبوو، خۆم چوومە پرسەکەی، ژنە هاتە دوکانەکەم بۆ بەهارات وتی ئاغا تۆم دی هاتی بۆ پرسەی خەزوورم. وتم ئەی ئافەرین کە تۆش لەوێ بوویت، بەشداری کەسوکاری مێردەکەت کرد، کە لێت جیابۆتەوە، جێی ڕێزە، ژن ڕێز لە کەسوکاری مێرد بگرێ من هەر ئەوەندە ئەڵێم خۆ ئەگەر ڕێکبکەونەوە ئەوە باشترە، بە تایبەتی نێوە منالێك لە نێوانتانایە.. وە گەر نا (مرۆڤ نەبێ لەبەر دڕکێك دەغڵێك نەسووتێنێ).

٢٠٢٢/٨/٢٦



ئەمڕۆژی ٢٠٢٢/٨/٣١، خوشکێکی بەڕێز لە ئەڵمانیاوە هاتبۆوە، زۆر بە گەرمی چاكوچۆنی لەگەڵا کردم..وتی ئاغا گیان ئەو کەشکۆڵەی پێشکەشت کردبووم پیشانی زۆر کەسم یاوە، یەکێ لەوانە هاورێ زەنگەنە لە کۆڕێکی ئەدەبیا هەڵسەنگاندنێکی باشی بۆ کرد.. ئاماژەی بەوەش یابوو کە لە کوردستانیش نووسەری باش هەیە.. بە نموونە باسی کەشکۆڵەکەی منی کردبوو.. زۆر سوپاسی ئەکەم.. دڵخۆشی کردم..



ئەمڕۆژی ٢٠٢٢/٩/٣، بێ نێوە ناخۆش سەروپێمان هەبوو، بە هەموو پێداویستییەکانیەوە، وەك ورگو شیلاوگو کەڵلەو پێچکەو زمان.. هەمووی لە سەر سفرە رازێنرابۆوە، کە خواردنەکەیان دانا، زمان کەوتە لای ژنەکەمەوە، پێموتن بەقوربانتانبم لێی دوورخەنەوە، نەك خوانەخواستە بیخوا.. نەوەنەیتر قوڕ بکا بە سەرما!! زۆر لە زمانی نەترسم. منالەکانیش وتیان باوکمان ناحەقی نییە.. ژنەش رووی تێکردمو وتی زمانی من چییەتی؟ زمانت بڕن.. وتم ژنەکە نەوەیەتی کە وتت..



برادەرێکی هونەرمەند هاتە دوکان، وتی ئاغا گیان کاتی خۆی فلان هونەرمەند دەعوەتی کردین بۆ نادی، لە دەعوەتەکەیا مامۆستا شێرکۆ بێکەسی شاعیریشی تیا بوو. خاوەن دەعوەتەکە وتی کاك شێرکۆ خێزانەکەم دووگیانە، ئەگەر منالی بوو، حەز ئەکەم ناوەکەی بە پیتی (هـ) دەستپێبکات.. ئەویش وتی ئەگەر کچ بوو ناوی بنێ (هەویر)، ئەگەر کوڕیشبوو، ناوی بنێ (هەلوك)، ئەگەر دوانەشبوون، کوڕو کچ بوون، ئەبن بە هەویرو هەلوك!..

منیش وتم برادەر ئەگەر منیش لەوێ بوومایە، پێشنیاری من بۆ کوڕ (هێز)و بۆ کچیش (هەناو) ئەبوو.. بۆ دوانەکەش ئەبوون بە (هێزو هەناو)!..

وتی ئاغا خۆزگە تۆش لە دەعوەتەکەیا بویتایە.. وتم گرنگ ئەوەیە ناوەکان کوردی بن...

٢٠٢٢/٩/٤



رۆژێك لە هەولێر لە سەر یەکێ لە شەقامەکان وەستابووم، چاوەڕێی دۆستێکم ئەکرد، کە ئەو شوێنەی بۆ دیاریکردبووم، بێ ئەوەی دەست لە تاکسی راگرم، یەك دوو تاکسی وەستان کە بمگەیەننە شوێنی مەبەست، دیاربوو منیان ئەناسی‌و هەڵوێستی جوامێرانەیانم بەرز نرخان.. بۆیە کردمە یادەوەریم لەگەڵ رێزما بۆیان..

٢٠٢٢/٩/٦

سەرلەئێوارەی ڕۆژی ٥/٩/٢٠٢٢، کاتی دوکان داخستن، بەرەوماڵ ڕێمکرد، بەلای دوکانی برادەرێکما، ئەویش لە هەڵگرتنی دوانەکەیابوو، هاوتەمەنیشمبوو، نزیکەی هەشتا، بەڵام ئەهلی کەیفو شەوقبوو، دوای سڵاو وتم کاك فلان ئەمڕۆشمان بەڕێکرد.. ئیتر نۆرەی پشوودانی شەوە، کە هیلاکی ڕۆژمان لەبیر بەرێتەوە.. وتی خەمت نەبێ تا ئێستا بێدڵی خۆم نەکردووەو زەرەریشم بۆ کەس نەبووە، بۆ هیلاکی ڕۆژیش دەرمانی شەوم هەیە، کە ڕەنجی خۆمە، ئەو هیلاکییەم لەبیر بەرێتەوە.. منیش وتم مافی خۆتە لە بەری ڕەنجی خۆت بخۆی.. پێموت:

ئەمڕۆش بەڕێکە، ئەمڕۆش بەڕێکە

هیلاکی ڕۆژت وەک کەوش لەپێکە

مافی مرۆڤە لە بەرهەمی خۆی

داخوازی بکا نۆشکا ئەو پێکە

* * *

بەم شێوەیە کیژۆڵەیەك خۆی پێناسام.. وتی ناوم (هەرزینە)، خەڵکی دێی قوماشم.. نزیك سەیسایەقو لە پۆلی حەوتم.. ناوێکی کوردی جوان، لە دێیەکی کوردستان...

٢٠٢٢/٩/٧

* * *

ئـەمڕۆژی ٢٠٢٢/٩/١٤، ئامـادەبووم لـە یانـەی وەرزشـی سـلێمانی کاتژمێر ٤ی پاشنیوەڕۆ بە بۆنەی کردنەوەی هۆڵێکی وەرزشی بە ناوی "هۆڵی شـێرکۆ فـارس"، کـە وەرزشـەوانێك و خـەمخۆرێکی شـارەکەمانبوو، زۆر لـە جێیخۆیدابوو بۆ کەسێکی شایستەی وا، کە خزمەتێکی گەورەی بە شارەکەمان گەیاندووە لەڕووی وەرزشیو کاری فەرمانبەریشەوە، کە بەڕێوەبەری تۆماری باری شارستانی بوو، خۆی هەستابوو بە پاراستنی سجلاتی نفوسی شارەکەمان، لە رۆژی راپەڕینی ١٩٩١دا، کە کەس بەکەس نـەبوو.. بـەڵام خۆزگـە ئـەو رێزەی بە چاوی خۆی بدیایە، نەك لە دوای مەرگی بوایە..

کاك شێرکۆ فارس، یەکێبوو لە هەرە هاوڕێ خۆشەویستەکانم، هـاوڕێی خوێندنو سەفەرمبوو، زۆربەی رۆژ بە دیـداری یـەکتری شـاددەبووین، جێـی داخە مەرگ مەودای بەردەوامی نەداین..



## یادەوەری تاڵ..

لەم رۆژەدا ١٩٧٨/٩/١٠، دێهاتەکانی سـنووری ناوچـەی شـارباژێڕ، سنووری ئێـران، داگـیران بـۆ کۆمـەڵگای کـەناروێ.. رۆژێکـی تـاڵبوو لـە مێژووا.. غەدرێکی گـەورەبوو لـە کـوردو کوردسـتان کـرا، وەکـو هـەموو غەدرەکانیتر...

٢٠٢٢/٩/١٠

ئەمرۆژی ۲۰۲۲/۹/۷، کیژۆڵەیەکی تەمەن سیانز ساڵ لەگەڵ دایکیا هاتنە دوکانەکەم، بە پەرۆشییەوە هاتە لامەوەو چاك‌و چۆنی لەگەڵا کردم‌و وتی مام ئاغا قەڵەمەکەی پار یاتمێ هەر ماومەو پاراستوومەو هیچم پێ نەنوسیوە، دڵم نایە بەکاریبێنم.. سوپاسی هەستیمکردو قەڵەمێکی شایستەی ترم دایەو پێموت ئافەرین بۆ خۆت‌و ئەمەك‌و هەستی جوانت کەسێکی شایستەی کە پێنووست بکرێ بە دیاری، دیاریش پێویستە بۆ یادگاری..

وەك نەریتی خۆم، رۆژانە پێنووس ئەبەخشم، بە تایبەتی بە منالاّن..



سەردانی ماڵێکی ئاسیاومکرد بۆ هەواڵ‌و دیدەنییان، یەکێ لە منالّەکانیان زۆر نارەحەت‌و شەرەشەقی ئەکرد، دایکی منالّەکە هیچ دەنگی نەئەکرد، باوکەکەشی هەستی بەوەکرد من نارەحەتم، یەکسەر لە منالّەکەی توورەبوو، وتی دانیشە سەلکەسەگ، ئەڵێی کێری باوکتی.. منیش زۆرم بەلاوە سەیربوو! وتم باشترین جوێنت پێیا، ئەگەر ئەو کێرەی تۆ نەبوایە ئەو سەلکەسەگە نەئەخولّقا!!

تێبینی: ئەم یادەوەرییە زۆر کۆنە، تازە هاتەوە یادم..

۲۰۲۲/۹/۱۵



## دایك فێرگەی منالە...

دایکی رەحمەتیم پارەی ئـەمرۆی نەئەخـستە سـبەینێ.. منـیش پێمئـەوت دایەگیان دەست بە پارەوە بگرە.. ئەیفـەرموو وەك دووپـشك وایـە فرسـەتت لێبێنێ پێتەوە ئەیا.. بۆیە پارەی ئەمرۆ نەخەیتە سبەینێ.. ئەمرۆ سـەرفیکەی لـە سبەینێ باشترە، یەتەوە جێگای..

بەهۆی دڵفراوانی دایکمەوە هەمیشە دەرگای ماڵمان ئاوەڵابوو بەرووی میوانانەوە، بۆیە وتراوە ژنو مـاڵ، بـە پێـچەوانەی رۆژگـاری ئـەمڕۆوە. کـێ فەرموو لـە کێ ئەکا؟! داخەکەم بۆ ئـەو رۆژانـە کـە میـوان رزقـی خـۆی بـە خۆیەوەبوو...

٢٠٢٢/٩/١٦



ئـافرەتێکی گوندنـشینی ئاسـیاومان هاتـە دوکانەکـەم، عەلاگەیـەکی بەدەستەوەبوو وتم ئەوە چییە؟ وتی مریشکە بۆیـان پـاککردووم ئەیبەمـەوە بـۆ لادێ..وتم بەڕێز ئەی تۆ لـە لادێ مریشكو کەڵـەشێرو قەڵو قاز بەخێو ناکەن؟ وتی ئەوەڵا ئاغاگیان تاقەتی ئەوانە هیچم نییە.. وتم ئەی کەڵەشێرەکەی خـۆت چۆنە؟ پێکەنی وتی ئاغا گیان بڵێ کەڵەباب.. وتم مایـام کەڵەبابەکـەت باشـە هەزار ئەوانی تر ئەهێنێ! وتی لـەخوا بەزیادبێ..

٢٠٢٢/٩/١٤

ئـەمڕۆژی ٢٠٢٢/٩/٢١ یەکـەم ڕۆژی وەرزی پـاییزە، بـەهیوام پـڕ بەرەکەتبیَو خوا لـە دەردو بـەڵاو سـەرما بمانپـارێزێو ئاگامـان لـە پۆشـتەیی خۆمانبێت، پێویـستمان بە داوودەرمـانو پزیـشك نـەبێت.. بـەم چـوارینەیەش هەستم دەرنەبڕم، ئەگەرچی تۆمارمکردووە بە چەند گۆڕانکارییەکی کەمـەوە، بەڵام وەك دەستپێکی وەرزەکە دووبارەی ئەکەمەوە، بـەهیوای لەشـساغی بـۆ هەمووان...

پاییز هاتەوە بۆ کۆکەو پـژمین
لە سەرما دووربین ئەبێ پۆشتەبین
خوا بمانپارێزێ لە میزەچوڕکە
ئاگادار نەبین حساب بۆ تڕکە!

هەر لـەم ڕۆژەدا چەند دڵۆپێك باران باری بەسەر خاکی وشـکهەڵاتووی هاویـندا، بـەڵکو بـە دەسـتلەملانێی ئـاوو خـاك، مرۆڤـەکانیش هەڵوێـستیان یەکخەنو ژیانێکی پڕ ئاسوودەییو کامەرانی بهێننە کایەوە بـە بووژانەوەیـەکی گشتی یەك هەڵوێستی لە خزمەتی یـەکترابین، چـۆن هـەوا گـۆڕا، دڵـەکانو هەستەکانیش باوەشیان گرتۆتەوە بۆ پێشوازی..



ئەمڕۆژی ٢٠٢٢/٩/١٩ خانمە کوردی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، ژینا ئەمینی (سەقزی) ، لە شاری تاران لەلایەن "پۆلیسی ڕەوشت"ەوە گیچەڵی پێکراو بە بیانووی دەرکەوتنی چەند تاڵە موویەك لە پرچی دوای ئەشکەنجەو سووکایەتی زۆر، سەریان دا بە لێواری شەقامەکەیاو دوای مانەوەی چەند ڕۆژێ لە نەخۆشخانە گیانی پاکی بە نیشتمان بەخشی، ئەوەش کاردانەوەیەکی جەماوەری کوردیو سەرتاسەری ئێرانی لێکەوتەوە، سەرەتا لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتو پاشان هەموو شارەکانی تری ئێرانی گرتەوە بە دروشمی (ژن، ژیان، ئازادی)..



ئەمڕۆژی ٢٠٢٢/١٠/٤ لە سەرتاشخانەیەکی ناسیاوم هاوڕێیەکم دانیشتبوو سەری مووی پێوە نەبوو، (أصلع)بوو.. سڵاوم لە سەرتاشەکە کردو وتم: سەری بێمووش ئەتاشن؟! وتی: قوربان بە نیازە بەری بۆ بتاشین!! وتم: برادەر کە پیاو سەری بۆ نەتاشرا، پەنا بۆ بەر ئەبات!!..



باوکی رەحمەتیم خوای گەورە بەهرەیەکی پێبەخشیبوو، کە پێشبینی لـە داهاتوو ئەکردو هەر کەسێکیش سەردانی بکردایە ئەیزانی نیەتی دڵـی چـیەو بۆچی هاتووەو خەڵکی چ شوێنێکیشە!.. دیارترین بەڵگەش کە سەردانی ماڵی خوای کرد بۆ فەریزەی حەج، بە هەموو کەسـوکارەکانمانی وتبـوو بـە تـەمای گەڕانەوەم مەبن.. دوا مـەنزڵگام ئەوێیـە!، هـەرواش دەرچـوو منـیش وەکـو وەچەیەکی بەڕێزیان ئەو بەهرەیەم تیا بەدی ئەکرێ..



ئـەمڕۆژی ٢٠٢٢/١٠/٦، چـاوم بـە ئـافرەتێکی ناسـیاومان کـەوت، کەسێکی بەدینو روو لە خوایە، وەکو بیستبووم لـە بارەیـەوە هەنـدێ جـار ئافرەتە مردووکانیش لەڕای خوا ئەشوات.. دوای سلاّوو چاکوچۆنی وتی ئاغا گیان ماڵەوەتان چۆنە؟ وتم زۆر وەزعی خراپە! وتی خوانەکا.. وتم ئەگەر خـوا خوانەخواستە کردی، بەڵکو تۆ بیشۆی.. وتی خەمت نەبێ خۆم ئەیشۆم..



ژنو پیاو کە ئەچنە تەمەنەوە هەر رۆژەی بەزمێك بە یەکتری ئـەگێڕن.. لێرەیا ئەو راستییە ئەخەمەڕوو، کە ژن زیاتر سکالاَ لەدەست پیریو بێهێـزیو شکستی جەستە ئەکات، بەتایبەت ئەو ژنانەی زیاتر لە ماڵەوە ژیان ئەبەنەسەر، زۆر بیر لە خۆیان ئەکەنەوەو سکالاَی تەندروستی خۆیان بەڕووی مێردەکانیانا ئەخەنەڕوو، کە گوایە بە تەنگیانەوەنین.. یەکێ لـە هاوڕێکـانم وتـی ئاغاگیـان دکتۆری دنیای پێکردوومو هـەر یـەك لەوانـە بـەپێی تێگەیـشتنی خـۆی داوو دەرمانو پشکنینی بۆ کردووە، هێشتا باوەڕی پێیان نییەو نازانم چیبکەم؟! لەتاو ئەو خۆمم لەبیرچۆتەوە.. دکتۆرەکـان زۆربـەیان بوونەتـە هـاوڕێمو سـوودی نییە.. وتم بەڕێز باشترین دکتۆرم بۆ دۆزیویتەتەوە.. وتی چییە؟ وتم شێخ رەزایی پێبلێ:

دکتـۆری تـۆ هـەر منم

دەعبات بە کێرو گونم

وتی باشترین دکتۆرە، ماڵت ئاوابێ..



خێزانێك هەیە بە شـێتە بـەناوبانگن، بـە یـەکێکیانم وت ئـەتوانی نـاوی ئاقڵێکم پێبڵێی لە خێزانەکەتانا؟ وتی من هەرە ئاقڵەکەیانم، کە لـە هـەموویان شێتترم!!.

٢٠٢٢/١٠/١٦

لە سەردانی نەخۆشێکا، کە لەسەر جێگەی مەرگبوو، لــە ئـانو ســاتی ماڵئاواییکردنابوو.. چەند کەسێك لە خزمو دۆستو ناسیاو بە دەوریەوەبوون بۆ دوا ماڵئاوایی.. یەکێ لەوانە وتی دۆعای خێری بۆ بکـەن، خـوای گـەورە رەحمی پێبکات.. نەخۆشەکە ئەوەندەی لە دەم هاتە دەرەوە وتـی پێویـست بـە دۆعا ناکات، خوا خۆی بەم وەزعەی گەیاندووم!!..

٢٠٢٢/١٠/١١



ئەمرۆژی ٢٠٢٢/١٠/٧، منالێکی ساوای تەمەن چوار مانگیان هێنا بۆ دوکانەکەم، کە بیکەمە باوەشمەوەو وێنەی لەگەڵدا بگرم، ئەوەش وەك رێزێکی دایكو باوکیو خۆشەویستییان بۆ منالەکەو رێزیـان بـۆ مـن.. بـە سوپاســەوە وێنەمان گرتو داوام لە یەزدان کرد کە بە دایكو باوك گەورەبێتو بـەختی چاکبێت.. کیژۆڵەبوو گوێشی سمرابوو..



رۆژی ١ی ٢ی ٢٠٢٣، سەر لە ئێوارە، رۆژێکی زۆر ساردبوو، مروڤتەزێنبوو، منیش بەبەر چایخانەی شەعبا ئەرۆشتم، چاوم کەوت بە برادەرێکم، کە زۆر لەرو لاوازبوو، وەکو ئەڵێن پێستی بە ئێسقانیەوە نووسابوو، واتە رەقو تەقبوو، پێموت برۆرەوە بۆماڵەوە تا رەقنەبوویتەتەوە.. ئەویش وتی جا بۆ لەمە رەقوتەقتر ئەبم؟!!



رۆژی ١٦ی ٢ی ٢٠٢٣ رۆژێکی ساردی زستانبوو، کاتی نیوەڕۆ، یەکێ لە برادەرانی منالیم، (د. رەئوف عوسمانو کورەکەی) هاتن بۆ دوکانەکەم بۆ کرینی هەندی بەهارات، پێموتن پارەتان لێوەرناگرم، وتیان نابێ ئەمە کەسابەتە.. وتم دە باشە وەرن نیوەڕۆ میوانی من بن. عوزرخوایان هێنایەوە.. وتم مەترسن هەمووگیانم ساردو سڕو تەزیوە، تەنها گیرفانم گەرموگوڕە!!!...



دوو برادەر هاتنە دوکانەکەم، یەکێکیان مۆبایلی بەگوێوەبوو، دیاربوو لەگەڵ خێزانەکەی ئەدواو ئەیوت بەهاراتی چیت ئەوێ بۆت بێنم؟ لەو کاتەیا تەماشای برادەرەکەیم کرد، زەردەخەنەیە گرتی، وتم چییە؟!! وتی ئەم هاورێیەم زۆر ژنانییە!.. وتم پیاو ئەگەر ژنانی نەبێ کەی پیاوە؟!! خۆ ئەگەر لێشی بترسێ ناهەقی نییە!!!

ئـەمڕۆژی ۲۰۲۳/۲/۲۷ لەگـەڵ بەڕێوەبـەری گـشتی باخـچەکانی سلێمانیو چـەند ئەنـدازیارێکی کـشتوکاڵیو شارسـتانی سـەردانی ناوەنـدی بەردەرکی سەرای (سلێمانی)مانکرد. لەبەر وێنەی شێخ مەحموودو پیرەمێـردی نەمردا، لە دەوری خواروو حەوزەکە پێشنیاری ئەوەمانکرد، کە بە شێـوەیەکی جوانی ئەندازیاری سەوزبکرێتو چەندین کورسی بۆ خانەنیشینانو گەشتیاران تیا دابنرێت بۆ حەوانەوەیانو بە شێوەیەبێت کە شایستەی شارەکەمان بێت.

شـایەنی وتنـە کـە بەڵێنیانـدا لەگـەڵ شـارەوانیا هەماهـەنگبن بـۆ جێبەجێکردنی ئەو کارە، کە پێشنیارێکی بەجێیە..



شەوی ۲۰۲۳/۲/۲۸ لە بەرنامـەی وێنـەگرافیا چـاوپێکەوتنێکی چـڕو پڕی لەگەڵ مامۆستایەکی دێرینی شارەکەماناکرد، چەندین وێنەیان نمایـشکرد، کە هەمووی گوزارشتی لە ژیانو گوزەرانو هەڵوێـستو خزمـەتگوزاری ئـەو بەڕێزە ئەکرد. لە یەکێ لە وێنەکانا کە هاوڕێـیانی مامۆسـتای تیـابوو لەگـەڵ خودی مامۆستا خۆی هەر هەموویان ئەمری خوایانکردبوو، تەنها مامۆستا خۆی نەبێت، کە فەرمووی تەنها خۆم ئەمری خوام نەکردووە!..



**سکاڵای ئاوارەیەکی هەندەران، لە دیدی خۆمەوە:**

مـن چیـم یـاوە لـە چـاوی شـیـن‌و
جـادەی پـان‌و پـارک‌و بـاڵـەخـانـە
خوا بیکا بە قوربانی کوڵانی گەڕەک‌و
سـەربـانی گـڵ‌و شـلـکێـنـەو کـەلانـە



ئـەمڕۆژی ٣/٧، یـادی راپـەڕینی شـاری سـلێمانییە، کەسـێك هاتـە دوکانەکەم مات‌و مەلوولبوو، دوای سلاو وتم خێرە ئەمڕۆ رۆژێکـی پـیرۆزە؟ وتی نەزانم، بەلام کە پیاو نەگبەتبوو بە هیچ شتێك دڵی خۆش نابێت، کۆمەڵێ دەردەدڵی خۆی لاکردم، چی داخ هەیە هەڵیڕشت، لە کۆتاییا وتم لەوە ئەچێ ناوی بەڕێزت عومەربێ؟! وتی چوزانی؟! وتم بـەوەیا ئـەزانم ئـەو زووخاوانـەی هەڵتڕشت لەم عومەرەشا هەیە!!



برادەرێکی هاوتەمەنم هاتە دوکانەکـەم، دەمێکبـوو دیارنـەبوو، هەنـدێ گلەیی‌و گازندەم لێکرد. وتی ئاغاگیان گلەیی چـی ئەکـەیت؟! بـۆ هـەردوو هێلکە گونەکەم نەشتەرگەرییان بۆ کـردووم، هـەر گونـەی (٨٥٠) هەشـت سەدو پەنجا هەزاری تێچووە! وتم سوپاسی خوا بکـە، بـەس نییـە سـێ هێلکـە گونت نەبوو!!

٢٠٢٣/٣/٢٥

ئــەمرۆژی ٢٠٢٣/٣/١٣ لەســـەر شـــەقامی پیرەمێـــرد، پیـــاوێکی تێکسمراوی باڵا مامناوەند بە روویەکی گەش‌و بەپەرۆشەوە سڵاویلێکردم‌و بە گەرمی هەواڵی پرسیم، سوپاسمکرد، وتی ئاغا گیان تۆ فریـشتەیت! وتم خێـرە براگیان؟! منیش هەر وەك ئەو خەڵکەم جیاوازیم نییە. وتی لـەم شـەوانەیا لـە خـەوما دەســتگیریانکردم‌و ئابلووقــەیان دام‌و بردمیانــە گۆڕەپانێکــەوە بــە دەستبەستراوی ئامادەیـانکردم بـۆ ئـەوەی گوللەبارانمکـەن.. لـەوەدابوو کـە دەستم لەخۆم شتبوو، تازە بێ پشتوپەنام، کەس فریام ناکـەوێ.. لـەو کاتـەیا بەڕێزت هاتیت، بڵاوەت بە هەموویانکردو منیـشت رزگـارکردو لـە خۆشـییا خەبەرم بۆوە، بڕیارمدا بە زووترین کات خۆم بگەیەنمە لای بەڕێزتان‌و پـیرۆزی کەسایەتیت پێڕاگەیەنم.. خۆشمت پێبناسێنم، ناوم فلانــەو فیــسار کــار ئەکـەم‌و خەڵکی ئەم شارەم..



﴿قنگی کەر!﴾

لە ناو ئێمەیا وا باوە کە کەسێك نەزان‌و گەمژەوگێلبێت پێیـەڵێن "لــە قنگی کەریش نازانێ"!. زەلامێك هاتەلام لە سەر کورسـی بـەر دووکانەکـەما دانیـشتبووم، دوای سـڵاو وتــی ئاغــا گیــان مــن زۆر بەهرەمەنـدم لــەڕووی هونــەری‌و ئــەدەبی‌و زانــستی‌و کۆمەڵایەتیــشەوە، ســەرم لــە هــەموو شــتێ دەرئەچێ.. منیش تەواو ریزم لێگرت‌و هەستامە سەرپێ، وتم دیـارە لــە قنگـی کەریش ئەزانی؟! وتی ئاغا گیان پزیشکی ڤێتێرنەریم، لەوەش ئەزانم!!

ئەمڕۆژی ٢٠٢٣/٤/٢٠، لەسەر بانگهێشتی (مامۆستا شێخ کەمال)، نەوەی شێخ حەسەنی گڵەزەردە، سەردانی چیای گڵەزەردەمانکرد، لەگەڵ هونەرمەندان ماهیر حەسەنو ئەحمەد جۆلاّو بەهادین نوریو مامۆستا ئەمێد عەلی مەرهونو کەسانێکیتر، بۆ بینینی مانگو ئاشکراکردنی جەژنی رەمەزان لەو شوێنەی کە شێخ حەسەنی گڵەزەردە لە کاتی خۆیدا زانیاری بەخشیوە بۆ دەستنیشانکردنی وەرزەکانو مانگەکانو جۆری ساڵەکان.. هەندێ زانیاریمان دەستکەوت لەو بارەیەوە کە جێی تێرامانو زیرەکیو لێهاتوویی کەسێکی وەك ئەو زاتەو هەڵکەوتنی لە ناو ئێمەی کوردا..

هەر بەو بۆنەیەوە ئێوارەخوانێکی شایستە دروستکرابوو بۆ میوانان، کە زۆربەیان لە کەناڵە ئاسمانییەکانەوە پەخشی راستەوخۆو چاوپێکەوتنی ئێمە بۆ دەربڕینی هەستمانو پیرۆزبایی جەژنی رەمەزان لە بینەرانو بیسەران.. لەڕاستیا هەستێکی زۆر خۆشیو شادی پێبەخشین لە بەهارێکی سەوزو تەڕو پاراودا، کە بووە مایەی ئارامی دڵو دەروونمانو بە رۆژێکی مێژوویی دائەنێم لە تەمەنی خۆما، بۆیە تۆمارمکرد..

تێبینی: نوسخەیەك لە قورئانی پیرۆزیان نیشاندایین کە تەمەنی لە چوارسەد ساڵ زیاتربوو، کە لە کاتی خۆیدا پێشکەشی شێخ حەسەن کراوە، لەو بارەیەشەوە هەندێ زانیاری ئەو مەسحەفەیان پێبەخشین، کە زۆربەی دەستنووس بووەو بەشێوەیەکی زانستی پارێزراوەو وەك خۆی ماوەتەوە..

لە هەموو ساڵێکا، ٢٤/٤، بۆمبارانی شاری قەڵادزێم دێنیتەوە یاد، کە ئەو کات ساڵی ١٩٧٤ روویداو لە چەقی رووداوەکەیابووم، منیش فەرمانبەری زانکۆ بووم، کۆمەڵێك خەڵکی بێتاوان بەرکەوتن لە دۆستو ناسیاو، کە بووە جێی دڵنیگەرانیو برینداری ئەو شارە قارەمانە خزمەتگوزارە، کە هەرگیز لە یادناکرێ.. درووود بۆ گیانی پاکی شەهیدانی ئەو کارەساتەو هەموو شەهیدانی گەلەکەمان..



**تێبینی ژیان:**

مرۆڤ لە تەمەنێکەوە بۆ تەمەنێکیتر ئەتوانێ بەم شێوەیە گوزارشت لە ژیانی خۆی بکات:

لە گەنجیا هەرچییەکت هەبێ بڵێ هەمە.. کە تەمەن هەڵکشاو پیری یەخەی گرتی، بڵێ هەمبوو...



لە کۆڕەوەکەی ساڵی ١٩٩١دا، هەموانماڵو حاڵو سامانمان بەجێهێشت.. چەند کەسێك لە دۆستو ناسیاو خۆشمان سکاڵامان ئەکرد.. یەکێکمان باش گوێڕایەڵی دەردەدڵمان بوو، وتی من لە هەمووتان دەوڵەمەندترمو گوێشی نایەمێ!، وتمان چۆن؟ وتی لەبەرنەوەی هیچم جێنەهێشتووە!!

لەناو ئێمەیا واباوە کە یەکێك خانووبکـا، یـان ژنبهێنـێ، ئیمـامی عـەلی زامنیتی‌و پاڵپشتی ئەکاو کاری بۆ ئاسانئەکا. بەڵام من لە خانووکردنەکەما ئەو پـشتگیرییەم پێنەبەخـشرا، لەبـەر ئـەوەی نـاوم عومـەربوو، لــە یـەکێ لــە کەشکۆڵەکانما ئاماژەم بەوەیاوە بۆ نەگبەتی وەستاو کرێکارەکانیشم هـەموویان ناویان عومەربوو، بەم جۆرەی خوارەوە:

١- عومەری خاوەماڵ.

٢- عومەری شیش.

٣- عومەری دیوار.

٤- عومەری تەختەبەست.

٥- عومەری گەچکاری.

٦- عومەری زەرعە.

٧- عومەری ئاوو ئاوەڕۆ.

ئیتر ئیمامی عەلی چۆن زامنی ئەم هەموو عومەرە ئەبێ؟!!



**خشتەی ئەو لایەن و دەزگایانەی ڕێزلێنانیان پێبەخشیوم، لەگەڵ سوپاس و پێزانینم بۆیان..**

١- ڕێزلێنانی یەکەمین فیستیڤاڵی شانۆی سالار ٢٠٠٦.

٢- خەڵاتی بەڕێوەبەرایەتی هونەری سینەمای کوردی ٢٠١٠.

٣- ڕێزلێنانی ڕێکخراوی ئاشتی خێرخوازی ٢٨/١٢/٢٠١٠.

٤- دیاری پارێزگای سلێمانی بۆ ساڵی ٢٠١٠-٢٠١١.

٥- خەڵاتی بەخشینی ساڵ ڕێکخراوی جەستەبەخشان ODOK، ١/١٢/٢٠١٤.

٦- ئەنجومەنی باڵای تالاسیمای کوردستان SSO.

٧- بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی سلێمانی ١/٣/٢٠١٤.

٨- خەڵاتی ڕێزلێنان بۆ گەشەپێدانی مرۆیی، لە ساڵیادی شاری سلێمانی ٢٠١٩.

٩- خەڵاتی ڕێکخراوی گۆڕینی ژیان ٢٠١٩.

١٠-ڕێزلێنانی بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان بە بۆنەی ڕۆژی هونەرەوە، یادی شەش ساڵەی.

١١-ڕێزلێنانی یەکێتی نووسەرانی کورد/ لقی سلێمانی، لە یادی (٥٠) پەنجا ساڵەیدا، ٢٠٢٠.

١٢-خەڵاتی ڕێزلێنانی کۆمەڵەی هونەری میللی کوردستان.

١٣-ڕێزلێنانی ڕێکخراوی چەمك و ڕێکخراوی ژیان ٨/٣/٢٠٢٣.

١٤- ڕێزلێنانی کۆمەڵەی کەلەپووری سلێمانی شەوی ٩/٣/٢٠٢٣.

هونەرمەندی گەورەو شاعیرو قسەخۆش، هاوڕێم، کاک عومەری کەریم ئاغا، پێشکەشە..

**(لەبیرمانی)**

**بەفری مێشکت بەخۆشییەوە نەچۆتەوە**

**بەداخەوە توانای جەستەت کەمبۆتەوە**

**بۆ هونەرو بۆ نواندن شۆڕەسواریت**

**لە شیعریشا شەبەنگێکی شوێنەواریت**

**قسەی خۆشت کانگەیەکە لەبن نایە**

**شکۆی ڕێزت پەلهاوێژە بۆ گشت لایە**

**تۆ ئەو کەسەی لە دڵماندای لەبەر چاوی**

**خامۆشبوونیش پێتناوێرێ تۆ هەتاوی**

**وشەی نەمری کە ئەستێرەی پرشنگدارە**

**هۆ (ئاغا) گیان وا میوانتە لەم دیارە**

مامۆستا

ئەحمەد حسێن

٢٠٢٣/٤/١٣



ئەمڕۆژی ٢٠٢٣/٥/٧، کۆڕێکی ئەدەبی بۆ ڕۆمانووسی بەئـەزموون، میران ئەبراهام، لە هۆڵی نووسەرانی کورد سازکرا، کاتژمێر چواری سـەر لـە ئێوارە، بـە ئامـادەبوونی ئاپۆرایـەك لـە ئـەدیب و هونەرمەنـدو ڕووناکبیرانو ڕۆشنبیران، منیش یەکێکبووم لە ئامادەبووان. پەرۆشی ئەوەبووم کە ڕۆژێ لە ڕۆژان بە خزمەتی ئەو بەڕێزە بگەم، پڕ بە دڵ پیرۆزبایی لەو بەرهەمـە جوانانـە ئەکەم، هەر خوێنەرێك بیخوێنێتەوە، هەڵسـەنگاندنی بۆ ئـەکا، کـە کـوردێکی جووی بەپەرۆش لەو ئاستەیابێتو کەموێنەبێ، جێی شانازی هەموان ئەبێ.

سـێ بـەرگم لـە بەرهەمـەکانی دەسـتکەوت، بـە واژۆی بەڕێزیانـەوە، وێنەیەکی یادگاریشمان پێکەوە گرت..

کە بە بەڕێزیانم وت من فلانکەسم، لەبەرم هەسـتاو ماچیکردمو وتـی وەرە جێگەکەم دانیشە..

لە یەکێ لە کەشکۆڵەکانما باسی ئەوەم کردووە کە باوکم کاتی خـۆی بەرگری لە جوولەکەیەك کردووەو لەسەری هاتۆتەدەنگ..



لەگەڵ گەورە هونەرمەندی کورد، کەریم کابان، یەکێ لە پیاوە گەورەکانی گەڕەکەکەمانو شارەکەمانو دراوسێی ماڵمانو خۆشەویستی هەموان، زۆربەی رۆژانی ژیانم چاوم پێیەکەوتو بە دیداری شادئەبووم. لەرێی ئاخاوتنو دیداری هەمیشەییمان گاڵتەوگەپو قسەی نەستەق نێوانمانی تەنیبوو، هەندی جاریش پەردەی شەرم ئاوەڵا ئەبوو، ئەگەرچی ئەو بە تەمەن لە من گەورەتربوو، بەڵام متمانەی زۆری پێمبوو، ناخو دڵو دەروونی لای من ئەخستەڕوو، منیش وەکو پێویست رووگیریم لێنەئەکرد، سەردانی ماڵو دوکانەکەشمی ئەکرد. چەند هەنگاوێك ماڵیان لێمانەوە دووربوو. ئەو لە گەڕەکی شێخانو من لە کارێزی ئەحمەد زەنگەنە، کە هەردوکیان ئەکەونە پشت سەرای سلێمانی ئێستاوە.

وێنەی یادگاریشمان پێکەوە گرتووە، دانیشتنی شەوانەشمان هەبووە. لەم دواییانەی ژیانیا، کە ئەخۆشکەوت، وەکو پێویست سەردانیم ئەکردو دڵخۆشیم ئەیایەوە بۆ ئەوەی تۆزێك لە ئازارەکانی کەمکەمەوە. گۆرانیمان پێکەوە ئەوت، منیش هەر بۆ خۆشی پێمئەوت هەرچی گۆرانییەکم بۆ ئەڵێی یاران وەسیەتم ئەبێ! ئەیوت بۆچی؟ ئەموت ئەو کۆپلەیەی تیایە کە ئەڵێ (ئەمەبێ لاتان)، برا ئەو ئامانەتەم بۆ ناپارێزرێ!، (هەرامەکەی)!.

٢٠٢٣/١٠/١٠



حەمە جەزای هونەرمەندو دەنگخۆشی گەلەکەمان زۆر ریزی لێئەگرتم، لە چەندین بۆنەیا یەکترمان ئەبینی، بە تایبەت لە ئاهەنگەکانی سەری سالآنا، کە وەکو سەرپەرشتیاری بەرێکردنی یادەکە، لەگەڵ بەرێزان هونەرمەند مەکی عەبدوڵاو سالار گەبەیی‌و فایەقی زەرِنگەر بەرێوەمان ئەبرد.

جگە لەوەی کورِی حاجی عەلی بەگ بووە، لە منالییەوە یەکتریمان ناسیوەو لە گوزەری بازارِا دراوسێ دوکانی باوکم بوون. کاکە حەمە کە هەندێ جار بێتاقەت ئەبوو لەرِێی هونەرمەند زانای مەحمود هەژارەوە پەیوەندی بە من‌و مامۆستا ئازادی حەمە بچکۆلی هونەرمەندەوە ئەکرد، کە بچینە ماڵەکەی، کە لە بەرامبەریا هۆڵێکی بۆ کەسێتی خۆی دروستکردبوو، کە هەموو پێداویستییەکی هونەری گۆرانی تیابوو، خۆی گۆرانی ئەچرِی‌و ئیقاعەکەشی ئەگرت‌و کاك زاناش بە کەمان، من‌و کاك ئازادیش هەندێ جار بە گۆرانی‌و بە کۆرس بەشداریمان ئەکرد.

وەك وەفایەك‌و ئەو ریزەی، بە پێویستم زانی ئەم یادەوەرییە تۆماربکەم، ئەگەرچی هەرگیز لەیاد ناکرێ.. هەزاران درورد بۆ گیانی پاکی‌و هونەرە رەسەنەکەی..

٢٠٢٣/١٠/١٠



هەندێ لە پیاوان کە ژنەکانیان دواماڵئاواییان لێئەکەن خۆیان بە خەمبارو زویر پیشان ئەیەن، کە گوایە زۆر کاریتێکردوون، لە راستیشا رەنگە پێچەوانەکەی بێت بۆ هەندێك..

یەکێ لەوانە کەسێکی زۆر نزیکمبوو، ئاگام لە وەزعو گوورزەرانیانبوو، ژنەکەی تا بڵێی ناشیرینو دەمەوەربوو، قەزاوبەڵای حازری بردبوو، خۆی بەو شێوەیە پیشانیام. منیش سەرەخۆشیم لێکردو پێموت خوا خۆشی ویستووی لەو بەڵایە رزگاری کردووی، دەمەوەرو ناشیرین! مەیموون راینەکرد لێی ، تۆ زۆر بەغیرەتبووی کە حەواڵەی پەروەردگارت کرد!!.

٢٠٢٣/١٠/٢



ئەوەی رۆحی تێنەچێ،

بزانە کێشەی تێنەچی!

٢٠١٩/١٢/٢١



مۆمەکان هەرچەند گەشاوەبن،

هەر بەرەو خامۆشبوون ئەچن،

مرۆڤەکانیش هەرچەندە بەهێزبن،

لە ئاستی مردنا ملکەچن!!

٢٠٢٠/٥/١٠



جوانی شێوە کاتییە،

جوانی رەوشت هەمیشەییە!

٢٠٢٠/٦/٧



کە پارەت کرد بە دروشم،

بزانە بووی بە قورقوشم..

٢٠٢٠/٦/٧

لە کۆمەڵگایەکام،

پارە ئەیەن بە نێرگەلە لەجیاتی کتێب..!!

٢٠٢٠/٩/٢٠



مرۆڤەکان

بە سیمای تەمەنیانەوە جوانن!!

٢٠٢٠/٩/٩



ئەگەر بە راوبۆچوونی خێزانەکەم بوایە،

نەئەبوومە خاوەنی کەشکۆڵەکانم!!

٢٠٢٠/٩/١٨



سلێمانی دەنگێکە،

بە هیچ هێزێك کپ ناکرێ!!

٢٠٢٠/٩/٢٠

ئەوەندە ژیان بگرە باوەش،

کە بتوانی لە باوەشیا هەڵکەی..

٢٠٢٠/٩/٢٩



ئەوەی بەرگدرووبێ،

حساب بۆ تەقەڵ نەکا..

٢٠٢٠/٩/١٢



لە هاوپیشەییا

گیانی پێشبڕکێ دروست ئەبێ..

٢٠٢٠/٩/١٣



ناوو ناوەڕۆ،

قەستەرەو باڵۆنی خانووە..

٢٠٢٠/٩/١٣



ئەوەی پارە بیەزێنێ،

کەسایەتی نادۆڕێنێ..

٢٠٢٠/٩/١٣



لای من،

هەموو کتێبێك بەسوودە..

٢٠٢٠/٩/٣



هەر شتێ ناوی ببەیت،

بایەخدانە پێی!

٢٠٢٠/٨/٢٨



بۆ ئەوەی دڵئارامبیت،

بە شتی لاوەکیەوە خەریك مەبە..

٢٠٢٠/٨/٢٨

لە پێشەنگی داوای رزقا بۆ عەبدانی خودا،

لە کتێبفرۆشەوە دەستپێنەکەم..

٢٠٢٠/٩/١٠



کەرکوك خەزنەیەکە،

کۆمەڵێ جەردە مرِیان لێخۆشکردووە!

٢٠٢٠/٩/١٣



ترِ تاراتی ناوێ..

٢٠٢٠/٩/١٧



منالٌ گەورەبێ دایك پشتی گرت،

پاداشتی باوك زیاتر نییە لە جرِت..

٢٠٢٠/٩/٢٢



هەموو شتێك لەبەرچاو ئەكەوێ،

تەنها نیشتمان نەبێ!

٢٠٢٠/٩/٢٠



ئەو كەسەی (تف) رۆئەكاتە سەر زەوی،

شەرمە بەسەریا بڕوات..

٢٠٢٠/٩/٢٩



بۆ ژیان ئەوەندە خۆت هیلاك بكە،

كە زەرەر لە جەستەت نەیا..

٢٠٢٠/٩/٢٩



وتراوە برسێتی رەگی هاری بەدەمەوەیە،

هەندێ جار تێریش لادان ئەهێنێتە كایەوە!

٢٠٢٠/٩/٢٩

ئەگەر نەخۆشێك هەواڵی تەندروستی پرسیت،

بڵێ خوا شفامان بات..

٢٠٢٠/٩/٣٠



پیاوی زمان درێژ،

کردار کورتە.!.

٢٠٢٠/١٠/١



مەرج نییە هەرکەس بخوێنێتەوە،

ببێتە خوێندەوار..

٢٠٢٠/١٠/١



لەبەر دڵناسکی خۆم،

نامەوێ دڵی کەس برەنجێنم

٢٠٢٠/١٠/٣

کۆرۆنا کارێکی وایکردووە،

موسوڵمانان دەستنوێژیان لەیەك ناشکێ..

٢٠٢٠/١٠/٦



لە شانسی ترسنۆکەکانە،

بوێرەکان مەرگ مەودای ژیانیان نادا!!

٢٠٢٠/١٠/٧



رێزی ئافرەت بە دەمیەوەیە،

پیاویش بە ئاخاوتنیەوە..



کورێنی بە کەڵکی پایز نایەت،

واتە ئەبێ پۆشتەو پەرداخ بێت..



ناوبژیوانی شەڕ زۆربێت،

شەڕەکە گەرمتر ئەبێت..



کە هاتینە ژیانەوە کۆڵمان بە کۆڵەوە نەبوو،

کە لێشی ئەچینە دەرەوە بێ کۆڵین..

٢٠٢٠/١٠/١٠



ئەوەی ئەیەوێ درزم تێبکا،

خۆی دەلاقەی تیایە!

٢٠٢٠/١٠/١٠



ئەوەی ئیشقی تیا نەبێت،

جەستەیەکی بێگیانە!

٢٠٢٠/١٠/١١



پێلاوێك لە پێناکەم،

بۆیاخچی بڵێ بۆیاخ ناکەی؟

٢٠٢٠/١٠/١١



شێتێك بە شێتێکی وت ئامۆژگاریمکە،

لە وەڵاما وتی پێویستت بە ئامۆژگاری نییە تۆ لە من ئاقڵتری..

٢٠٢٠/١٠/١٣



لە تێگەیشتنی ژیان،

پێکەنین بەرهەم بهێنە..

٢٠٢٠/١٠/١٣



لە تاریکییا،

شتی ونبوو نادۆزرێتەوە!

٢٠٢٠/١٠/١٧

ئەگەر تەمەن بە پارە بوایە،

دەوڵەمەند نەئەمردا!

٢٠٢٠/١٠/٢١



خوای گەورە دژایەتی بەندەکانی ناکات،

بەندەکان خۆیان دژایەتی یەکتری ئەکەن..

٢٠٢٠/١٠/٢٦



لە بوونی دەست تەنگیا کەسایەتی دروست نابێ،

بەڵام لە بوونی دڵفراوانیا کەسایەتی بەدەستدێت..

٢٠٢٠/١٠/٢٦



ئەوەی رۆحی تێنەچێ لە چاوەڕوانیدایە،

هیچ شتێکیش هێندەی چاوەڕوانی ناخۆش نییە..



کورد لە مرۆڤدۆستیا کەموێنەیە،

بەڵام جێی داخە وەکو پێویست ڕێز لە مرۆڤی خۆی ناگرێ!

٢٠٢٠/١٠/٢٨



کە ژن وتی نەخۆشم،

تۆش بڵێ لەدەستمداوە کۆشم!

٢٠٢٠/١٠/٢٨



خۆم بە قەرزاری هیچ شتێك نازانم،

تەنها کتێب نەبێت!!

٢٠٢٠/١٠/٣١



هەر پیاوێ شانسی لە ژنیا نەبوو،

لە ژیانیشیا نییەتی!!

٢٠٢٠/١١/٥

زیرەکترینو زرنگترین پیاو ئەوەیە،

کە لە ئاخی ژن تێئەگات!!

٢٠٢٠/١٠/٤



رۆژێك تێکەوتووین،

وەچە لە باوكو دایك توورەئەبێ!!

٢٠٢٠/١١/٢٥



هەموو ئەبین بە قوربانی منالٚ،

منالٚیش ئەمانکات بە قوربانی!

٢٠٢٠/١١/٢٣



ژیان تەوقێکە لە ملی گیاندارانایە!!

٢٠٢٠/١١/٣١



ئەو کەسەی نەتوانێ خۆی بەرێ بەڕێوە،

ناتوانێ کەسانی دیکەش بەرێ بەڕێوە!



مرۆڤ بە کردەوەی ژیانی،

ئەتوانێ درێژە بە ژیانی دوای مەرگیشی بدات..

٢٠٢٠/١٢/٣



تا تووشی کێشە نەبیت،

نازانی کێشە چییە؟!!

٢٠٢٠/١٢/٣



خراپی خۆمان چاکبکەین،

باشترە لەوەی دوژمنی خراپ بێتەوە ناومان!!

٢٠٢٠/١٢/٤



هەندێ جار هەڵە راستیت بۆ دەستەبەر ئەکا..

٢٠٢٠/١٢/٥



هەر ژنێك کەسوکاری مێردی ویست، واتە مێردەکەشی ئەوێ!!

پێچەوانەکەشی هەر وایە..

٢٠٢٠/١٢/٥



ئەگەر ئەتەوێ ئەمرۆ بە ئارامی بژیت،

ئاڵۆزی سبەینێ فەرامۆشکە..

٢٠٢٠/١٢/٨



کە نەمبوو هەوڵی بوونم یا،

کە بووم هەوڵی زیاترم یا،

کە زیاترم بوو، جەستەم شەکەت بوو!!

٢٠٢٠/١٢/١٠

وتیان ئاغا چۆن لە ژیان گەیشتووی؟

وتم ئەم پرسیارە زۆر وەڵام وەردەگرێ..

بە کورتیو بە کوردی

"تاقیگەیەکە بۆ هەڵسەنگاندنی مرۆڤەکان"!!

٢٠٢٠/١٢/١٢



هونەرو ئەدەب منیان نەژیان

بەڵکو ژیانم کرد بە قوربانیان!!

**تێبینی:** لە رووی ماددیەوە، بەڵام ڕێزی زۆریان پێبەخشیم،

وەك کەسایەتیم!!

٢٠٢٠/١٢/١٣



بەداخەوە رۆژێك تێکەوتووین،

راستی رەواجی نیە!!

٢٠٢٠/١٢/١٧



کەمی پڕ لە زۆری فڕ باشترە!



چەندە زۆرت بێ، روو لە نەمانە
بە کەم رازیبوون کارێکی جوانە



ژیان لای من هەواو هەوەسێکە
جگەرەکێشبی تەنها نەفەسێکە



ئافرەت بە دەمیا نەناسرێت!!

٢٠٢٠/١٢/٢٩



زۆربەی جار کە لێمئەپرسن ئاغا چۆنی؟
ئەڵێم ئەگەر خەڵکی بە گشتی باشبن، منیش باشم..



لە بارودۆخێکدا ئەژین،

کە کەڕولاڵەکانیش کەوتوونەتە بیستن و ئاخاوتن،

بۆ دەربڕینی ناڕەزایی!

٢٠٢٠/١٢/٣٠



ئەوەی پارە پەرستبێ،

هیچ شتێکیتر ناپەرستێ!

٢٠٢١/١/٣



ژیان بە جوولەوە جوانە..



ماڵی بێ ژن وەك کانی بێئاوە..

٢٠٢١/١/٥



مرۆڤەکان،

بەقەبارەی خۆیان خەمبارن!

٢٠٢١/١/١١



ژیان،

جۆرێکە لە گیرۆدەیی..

٢٠٢١/١/١٢



کڵاومان با بردوویەتی،

ئێمەش بە دوایا ڕانەکەین!..

٢٠٢١/١/١٢



سزای ژیان تێیگەیاندین،

کە سزای مەرگ نییە!..

٢٠٢١/١/١٣

خودا،

راگری ژیانە..

٢٠٢١/١/١٤



هەموو مرۆڤێك،

خاوەنی سێبەری خۆیەتی..

٢٠٢١/١/١٦



ئەو کارەی خۆت بتوانی ئەنجامی بەیت،

پەنا بۆ کەسێکیتر مەبە!..

٢٠٢١/١/١٧



هەر وڵاتێ لادێی نەبێ،

شاریشی نابێ..

٢٠٢١/١/١٨

کاتێ بیر لە پارە نەکەمەوە،

کە پێمنەبێ!!

٢٠٢١/١/٢١



تا کتێب هەبێ بێ هاورێ نابم،

تا خەڵکیش هەبێ بێ ژیان نابم..

٢٠٢١/١/٢٦



کەمامەی دژە کۆرۆنا،

ناشیرینی باوێشکیش نەشارێتەوە..

٢٠٢١/١/٢٦



کەمی بێکێشە،

لە زۆری بەکێشە باشترە..

٢٠٢١/١/٢٨

لە ژیانما هەوڵم یاوە،

زمانم نەسپمێ!..

٢٠٢١/١/٣٠



بۆ پیاو..

ئەگەر ژنت باشبێ،

سەر سفرەت نانی رەقیشبێ،

بەختەوەری!!

٢٠٢١/٢/١



کەر نەمێنێ،

کورتان پارە ناکا!..

٢٠٢١/٢/٣



خەڵکیم ئەوەنە خۆشنەوێ،

دڵم نایە تێر سەیریانکەم..

٢٠٢١/٢/٣

ئاخونەك،

لە ئاستی عیبادەت کەم ئەکاتەوە..

٢٠٢١/٢/٣



ئەوەی ژنو منالّی نەبیّ،

هەموو جیهان مالّی ئەوە..

٢٠٢١/٢/٥



ژیان لە لای من دەردی سەرییە،

خۆزگەم بەو کەسەی لیّی بەرییە..

٢٠٢١/٢/٩



لە نواندنا هەر رۆلّیّکم دیبیّ،

خۆم دەرهیّنەری بووم..

٢٠٢١/٢/٩

هەندێ خۆیان بە نووسەر ئەزانن،

بەڵام بەرهەمی هاوپیشەکانیان ناخوێننەوە..

٢٠٢١/٢/٩



پارە کە بوویت بە دیلی،

بگەڕێ بۆ بەدیلی..

(پارەپەرستی ریسوایی لەدوایە)

٢٠٢١/٢/١١



ئەوەی بەرگەی رەخنە نەگرێت،

با رەخنە لە کەس نەگرێت..

٢٠٢١/٢/١٣



ئەوەی بکەوێ بە زەویا،

زەوی هەڵیئەسێنێتەوە..

٢٠٢١/٢/١٣

گەر سەدساڵیش تەمەنکەیت،

هەر بیستساڵ ژیاویت..

٢٠٢١/٢/١٣



ئەوە تەمەنی گەنجییە،

کە هەست بە بەرپرسیارێتی ناکەیتو

هێزی بەرگریشت باڵایە..

٢٠٢١/٢/١٣



ئەوەی بێتە سەر تێری،

ژیان ناچێتە ژێری..

٢٠٢١/٢/١٣



کاتێ هەنگ ئەڕوا بۆ مژینی شیلەی گوڵێك بیکاتە هەنگوین،

بیر لە ڕێگری زەردەواڵە ناکاتەوە کە دژیەتی..

٢٠٢١/٢/١٥

یەکێ لە دیاردە ناشیرینەکان کە لە مرۆڤدا هەبێ،

ئەوەیە کە لە پیریا دەوڵەمەندبێ، بەڵام رەزیلبێ..

٢٠٢١/٢/١٥



پارێزەر جەستەی داواکارە..

٢١٢١/٣/١



خەمی منالّ گەورە نەکوژێ..

٢٠٢١/٣/١



کەسی رەبەن جیهان ماڵێتی..

٢١٢١/٣/١



هەموو مرۆڤێك،

تاپۆی گۆڕی پێیە!..

٢٠٢١/٣/٢

ئاساییە لە ناو گوڵانا گوڵبیت،
گرنگیشە لە ناو دڕکانا بە گوڵی بمێنیتەوە..

٢٠٢١/٣/١٢



لەگەڵ مرۆڤی چرووکا،
هەڵکردن ئەستەمە!!..

٢٠٢١/٣/١٤



ئەو پیاوەی ژن نەیگرێنێ،
ژیان نایگرێنێ..

٢٠٢١/٣/٢١



ئەو کەسەی باوەڕت پێیەتی،
هەموو نهێنییەکانی پێمەسپێرە..

٢٠٢١/٤/٤

ژنی باش رایەڵی پیاوە،

خراپیش هۆی لادانێتی..

٢٠٢١/٤/٤



لە چاکەکاریا کەس هێندەی مرۆڤ چاك نییە،

لە خراپیشا هەر مرۆڤە وێنەی نیــە!..

٢٠٢١/٤/٦



ئەو گیرفانە کونبێ،

بەخششی تیانەبێ!

٢٠٢١/٤/٦



مرۆڤەکان تا نەمرن،

هەر شاگردن..



ژیان

جۆرێکە لـە خۆخەڵەتاندن



کورد،

هەموو شتێکی بەتامە خۆی نەبێ..



لاوازی مرۆڤـ،

لـە خۆبەدەستەوەدانایە..



میللەتی چاوچنۆك،

نەکەوێتە سەر چۆك..



شوانو باخەوان،

خۆشەویستی خوان..

شانازی بە هەر شتێکەوە بکەم،

ماڵو سامان ناگرێتەوە..

٢٠٢١/٤/١٥



ژیان بریتییە لەوەی،

دڵی خۆت خۆشکەی،

دڵی خەڵکیش نەڕەنجێنی..

٢٠٢١/٤/٢٥



ئەگەر تەندروستی دەرگای هەبێ،

لە دەمەوە دەستپێنەکات..

٢٠٢١/٥/٥



لە ژیانما ئەو شتەی خەمباری کردووم،

ئەوەیە فێری مۆزیك نەبووم..

٢٠٢١/٥/٦

لە ناو کوردا گەورەیی مرۆڤ،

دوای مەرگی دەرئەکەوێ..

٢٠٢١/٥/٦



مرۆڤ لە هەر تەمەنێکابێ،

تەندروست باشبێ،

ئەتوانێ خزمەت بکا..

٢٠٢١/٥/٧



ئەوەی خوێندەواربێ،

خوێندنەوە فەرامۆشناکا..

٢٠٢١/٥/٧



راپەڕین بەرپەرچدانەوەی

شکستی شۆڕشی ئەیلوولە..

٢٠٢١/٥/١٤

پێکەنینی پێش مەرگ،

فرمێسکی دوای مەرگ ئەهێنێ..

٢٠٢١/٥/١٥



تکایە دوای مەرگم،

بە ویژدانەوە لەسەرم بدوێن..

٢٠٢١/٥/١٥



ئەوەی تووشی کێشە نەبێت،

کێشەی بۆ چارەسەر ناکرێت..

٢٠٢١/٥/١٥



ئەگەر ئەتەوێ بەختەوەربیت،

لە ئیرەیی دوورکەوەرەوە..

٢٠٢١/٥/١٧

لە رۆژگاری ئەمڕۆیا،

دوو شت پیاو نەبەستێتەوە،

بەرژەوەندیو خێزان..

٢٠٢١/٥/١٧



ئەمڕۆ بیخۆ،

سبەینێ هی تۆ نییە!!..

٢٠٢١/٥/٢٣



مردن پاداشتی ژیانە!!..

٢٠٢١/٥/٢٤



خۆشترین ژیان ئەو ژیانەیە،

کە هێشتا نەهاتوویتەتە ناوی..

٢٠٢١/٥/٢٧

هەندێ کەس ئامۆژگاری خەڵکی ئەکەن،

کەچی خۆیان فەرامۆشکردووە..

٢٠٢١/٦/٢



هەر کەسێکت خۆشنەویست،

پێیڵێ دەوڵەمەندی پیسکەبیت..

٢٠٢١/٦/٢



ئەو کەسەی ئاخاوتنی لەگەڵ ئەکەیت،

رەچاوی تەمەنی بکە!..

٢٠٢١/٦/٨



مرۆڤ لەو کاتەیا شتە،

کە دژایەتی نەکرێ!

٢٠٢١/٦/١٠

ئەگەر ماڵو منالّ وەك خەڵك منیان خۆشبویستایە،

خەفەتیان نەئەیامێ..

٢٠٢١/٦/١٠



بەخشین توانای ئەوێ!!

٢٠٢١/٦/١١



ماڵو سامان،

ئەتوانی کەسایەتی پێدروستکەیت و

لەناویشیبەری...

٢٠٢١/٦/١١



ژیان بەهەشتی شێتانە..

٢٠٢١/٦/١٣



وەجاخت کوێربێ باشترە،

لەوەی منالی خراپت هەبێ..

٢٠٢١/٦/١٤



وتراوە بەرد لەجێی خۆی سەنگینە...

(هیوادارم منیش بەردێکبم)!

٢٠٢١/٦/٢١



کە ماڵت هەبوو میوانت نەبێ،

ئەوە کەی ماڵە دەبا هەر نەبێ!

٢٠٢١/٦/٢٣



تەمەنو کات وەکو یەکوایە،

هەر لەبەری ئەڕوات..

٢٠٢١/٧/١

پارەدان بە سواڵکەر،

سووکایەتی پێکردنیەتی!..

٢٠٢١/٧/١٤



تا کتێب نەکەیتە هاوڕێت،

ناتوانی هاوڕێیەتی ژیان بکەیت..

٢٠٢١/٧/١٥



هەڵسەنگاندنی بووك،

بە ڕێژەی مارەیی نییە..

٢٠٢١/٧/٢٢



خواستی مرۆڤ بۆ ژیان،

وەك چوونە گەرماو وایە،

هەیە بە دوو دەست خۆشتن سوکنایدێت،

هەشە بە دە دەست سوکنایی نایەت..

٢٠٢١/٧/٢٦

مرۆڤـ بۆ سزا دروسـتبووە،

کە ژیانە!.؟.

٢٠٢١/٧/٢٦



کۆمپیوتەر،

شاگردی ئەقڵە!..

٢٠٢١/٧/٢٧



هەرکەسێ بەبێ هۆ نیشتمان جێبێڵێ،

ئامادەیە دایکیشی جێبێڵێ..

٢٠٢١/٨/١



گەنجێتی هێزی بەرگریە،

٢٠٢١/٨/٣



هەموو شێوەیەك،

سێبەری خۆی وەرنەگرێ..

٢٠٢١/٨/٣



تەماعی ژن،

پیاو نەخاتە هەڵەوە..

٢٠٢١/٨/٤



ژیان لای من ئەو شیرینییەیە،

کە نەخۆشی شەکرەت هەبێ‌و نەتوانی بیخۆی..

٢٠٢١/٨/٤



ئازایەتی ژن،

بە سیمای چێشتخانەکەیا هەڵنەسەنگێنرێت...

٢٠٢١/٨/٤

خۆزگە دوا هەناسەم..

لەسەر شانۆ،

یان لە کتێبخانە،

یان لە کارێکی خزمەتگوزاریا بووایە...

٢٠٢١/١٠/١٩



بە هەڵەی خۆت،

کەسانێ تووشی هەڵە مەکە..

٢٠٢١/١٠/٢٠



لە (لەندەن) کات ژمێری (بیگ بن) هەیە،

لای ئێمەش سواڵکەری (بیگ بن)،

کە بە درێژایی ژیان کارنەکات..

٢٠٢١/١٠/٢١



هەر شاگردێ نوشوستی وەستای بوێ،

حەرامخۆرو حەرامزادەیە..

٢٠٢١/١٢/١٧



دانانان بە هەڵەدا،

راستی دێنێتە کایەوە...

٢٠٢١/١٠/٢٠



ئەگەر هێزی بەخشینت نییە،

هەوڵی دەوڵەمەندبوون مەیە..

٢٠٢١/١٢/٢٠



ئەگەر قەناعەتت بوو،

ئەوەندە بەسە بتوانی بژێوی ژیان بەرێکەیت!..

٢٠٢١/١٢/٢١

منالٚ تا گەورەی ئەکەی خوێنت ئەبێ بە ئاو،

کە گەورەش ئەبێ خوێنت ئەکا بە ئاو..



مرۆڤـ ئەوەندەی لـە مرۆڤـ ئەترسێ،

ئەوەندە لـە خوا ناترسێ!..

٢٠٢١/١٢/٣٠



هەر رۆژێك دەستی بەخشینم تیانەبێ،

خۆم بە مرۆڤـ نازانم...

٢٠٢٢/٢/٢



لـە هەڵوێستا،

پیری نییە!...

٢٠٢٢/٢/٦



هەموو مرۆڤێك،

دادگای خۆیەتی...

٢٠٢٢/٢/١٢



لەو باوەڕەدام دوای مەرگم،

پشکنینم بۆ نەکرێ..

بەڵام پێمناڵێن جێگەی چی نەگرێ؟!!

٢٠٢٢/٢/١٢



خاکپەرستی پێش خواپەرستییە..

خوا لە پەرستن بێباکە،

بەڵام خاك نەخوازێ..

٢٠٢١/٦/١٨



ئەو کەسەی لە وڵات ئەتۆرێ،

ئاوارەیی ئاشتی ناکاتەوە...

٢٠٢٢/١/٣٠

هەر کاتێ هەستت بە شکستی خۆت کرد،

ئەبێ هەوڵدەی شکستخواردوو نەبی..

٢٠٢٢/٢/١٣



لە ژیانما هەوڵی ئەوەم یاوە،

کە دوای مەرگیشم،

بە زیندوویی بمێنمەوە..

٢٠٢٢/٢/١٧



رووناکی مۆم لە تارکییا دیارە،

هەڵوێستی مرۆڤیش لە لێقەوماما..

٢٠٢٢/٢/١٧

ئەگەر داوای رزق بکەم،

کتێبفرش ئەخەمە پێشەنگ..

٢٠٢٢/٢/٢٠



ماڵی بێ کچ،

بیدە بە ورچ..

٢٠٢٢/٢/٢٠



رەگەزپەرستی لە هەر شتێکا هەبێ،

نابێ لە فێربوونی زمانا هەبێ..

تێبینی:

رەگەزپەرستی کارێکی نەشیاوو نارەوایە، ئەبێ مرۆڤ دۆستی مرۆڤبێ،

لە هەر رەگەزو بیرو باوەڕێکدابێ..

٢٠٢٢/٢/٢١



ئەو رۆژە نەگبەتی لادێکانمان بوو،

کە هێلکەیان لە شارەوە بۆ ئەبردن..

٢٠٢٢/٢/٢٢



کۆڵی ئەمڕۆ،

هەڵمەگرە بۆ سـبەینێ..

٢٠٢٢/٢/٢٥



ژیـــان،

جۆرێکە لـە گیرۆدەبوون.

٢٠٢٢/٢/٢٥



دڵـنیابن لـێپرسـینـەوە،

لـە سـەر زەمینـایە نەك لـە ژێریا..

٢٠٢٢/٢/٢٧



ئەوەی کە ئەیخۆی ئەوە هی خۆتە،

بەڵام کە ئەیخۆی ئەوە بۆ شووتە..

تێبینی: (شوت)، تێهەڵدان، کە بۆ (تۆپ) فووتبۆڵ بەکاردێ..



ئەشێ گریان،

ببێتە چەکی خۆپاراستن..

٢٠٢٢/٣/٥



یاسا نەیخوێنی باشترە،

لەوەی بیخوێنیو نەتوانی کاری پێبکەی..

٢٠٢٢/٣/٧



ئەو کەسەی مێژووی جوولەکە نەخوێنێتەوە،

هەست بە ئازاری نەتەوەکەی ناکات..

٢٠٢٢/٣/١٨



هەر شوێنێ ژیانتی لێبێ،

نیشتمانتە..

٢٠٢٢/٤/٣



مادەپەرستی،

دۆستایەتی ناهێڵێ..

٢٠٢٢/٤/٤



لە چاکەوە بچۆ بۆ چاکتر،

نەك چاك خراپکەی..

٢٠٢٢/٤/٤



ئەوەندە بەجێبهێڵە،

کە میراتگرەکان بەشەڕ نەیەن..

٢٠٢٢/٤/٦



هەموو مرۆڤێك دادگایەکە،

ئەتوانێ پەیڕەوی یاسا بکا..

٢٠٢٢/٤/٦



هەر کاتێ خەیاڵو خولیات بۆ کاری خزمەتبێ،

درێژە بە تەمەنی کرداریت نەیەیت..

٢٠٢٢/٥/٥



پیری،

جۆرێکە لە سزای گیانلەبەران..

٢٠٢٢/٥/١٢٢



بەزەییم بە هەموو گیانلەبەرانا یەتەوە،

بە شێریشەوە..

٢٠٢٢/٥/١٣



سامانو ماڵو ئاستی هەر مرۆڤێك،

ئەوەیە کە دوای مەرگی،

پێیدەبرێت..

٢٠٢٢/٥/٢٠



لە رەفتارو کردارو گوفتاری باش،

کە لە ژیانا پەیڕەو ئەکرێ،

ئاستی مرۆڤایەتی دیاری ئەکات..

٢٠٢٢/٥/٢٠



هەر مرۆڤێك هاوڕێی کتێب نەبێ،

هاوڕێیەتی خۆشی پێناکرێ..

٢٠٢٢/٥/٢٠



کارێکی قێزەونە،

مرۆڤـ لە پیریا دەوڵەمەندبێ‌و چرووکبێ..

ئەگەرچی چرووکی خۆی قێزەونە..

٢٠٢٢/٥/٢١



بەرچـاوتێـربە      ئەهلی خێـربە

ژیـان بەرێـکە      لێـوەی فێـربە

٢٠٢٢/٦/١١



مرۆڤی گەورەو بەڕێز،

ئەو مرۆڤەیە، کە توانای بەخشینی هەبێ و

چاوەڕێی هیچ پاداشتێك نەکات..

٢٠٢٢/٦/٢٤



رۆژێك تێکەوتووین،

ئافرەتان لووتیان ئەقرتێنن،

پیاوەکانیش مووی سەریان ئەڕوێنن..

٢٠٢٢/٦/٢٧



ئەمڕۆ پێبکەنە،

مەگری بۆ سبەینێ..

٢٠٢٢/٧/٤



وریابن،

گەنجیتی نەتانگەوجێنێ!..

٢٠٢٢/٧/٤



بە کەم رازیبی زۆرت بۆ دێنێ،

پارووی زل بگری هەرەس ئەهێنێ..

٢٠٢٢/٧/٥



لە ژیانما هەوڵی ئەوەم یاوە،

کە لە ناو دڵی خەڵکیا بژیمو

خەڵکیش لە ناو دڵما بژین..

٢٠٢٢/٧/٥



مرۆڤ گەرای رووداوە..

٢٠٢٢/٧/٧



ئەوەی ئاشتیخوازبێ،

شەڕ بەرۆکی ناگرێ..

٢٠٢٢/٧/٧



ئەمانەی وێنەیان ناگیرێ..

ئەقڵ، خوا، بەهەشت، جەهەننەم، رۆح (گیان)..

٢٠٢٢/٧/١٧



هەموو شتێك بە قەبارەی خۆی،

خۆشیو ناخۆشی هەیە..

٢٠٢٢/٧/١٧



کچ کە چووە ماڵو مێردی خۆیەوە،

چاوی لە ماڵی باوکێتی بۆ ماڵەکەی..

٢٠٢٢/٧/١٩



مرۆڤی لێبوردە،

لە هێزا شاخە نەك گردە!..

٢٠٢٢/٧/١٩



ئاشتیخوازان،

مرۆڤدۆستن..

٢٠٢٢/٧/٢٣



زانایەکی کۆمەڵناس فەرموویەتی:

مرۆڤ لە ژیانیا ئەبێ وریای سێ شت بێت..

یەکەم: بیرکردنەوە لە کاتی تەنیاییدا.

دووەم: رەوشت لە ناو خێزاندا.

سێیەم: زمان لە ناو خەڵکدا..

٢٠٢٢/٧/٢٩

لە دوو کاتدا نەتوانی مرۆڤ هەڵسەنگێنی،

کاتی توورەبوونیو کاتی هێمنیو خۆڕاگری..

٢٠٢٢/٧/٢٨



هەندێ کەس وەك دووپشك وایە،

ئەگەر کەسی دەسنەکەوێ،

بەخۆیەوە ئەیا!!

٢٠٢٢/٧/٣٠



رەنگە مرۆڤ بتوانێ بە وتەی چاك

ئاستێکی بەرز بۆ خۆی بێنێتە کایەوە،

بە پێچەوانەشەوە لە ئاستی خۆی دابەزێنێ،

بۆیە ئەبێ بزانێ چۆن ئەدوێ!!

٢٠٢٢/٨/٧



هەر میللەتێك،

یادەوەری نەبێت

بوونی نییە..

٢٠٢٢/٨/١٠



ئەگەر کۆمێنت و هەستی جوانی دڵسۆزانم تۆمارکەم،

کەشکۆڵێکی لێ بەرهەم دێت..

٢٠٢٢/٨/١٠



میهرەبانی مرۆڤ هەستێکە،

هەموو مرۆڤەکان لێی تێئەگەن..

٢٠٢٢/٨/١٤



پیری ئەستۆپاکی ژیانە..

پیری سزای گۆڕ ئەبا..

٢٠٢٢/٨/١٩



من ئەو وەچەیەبووم،

کە گەورەبووم پێویستم بە باوکم نەبوو،

کە بووشم بە باوك،

منەتم بە وەچەم نەبوو..

٢٠٢٢/٨/٢١



وەفای ژیان وایە،

ئەگەر پرێشتکا،

ترِت ئەکا!!

٢٠٢٢/٨/٢٣



زۆربلێیی،

لە کەسایەتی مرۆڤ کەمئەکاتەوە..

٢٠٢٢/٨/٢٤



بەختەوەری ژنو مێرد،

لە چاکی هەردوکیانایە...

٢٠٢٢/٨/٢٤

پارەم پێبێ،

ناتوانم خەرجی نەکەم

٢٠٢٢/٨/٢٥



کەس لە خۆت،

بە کەمتر مەزانە..

٢٠٢٢/٨/٢٥



هەر کاتێ بلێی لە لوتکەیام،

چاك بزانە وەستاوی..

٢٠٢٢/٨/٢٦



بۆ سامانداره‌کان.

ئەوەی ئەیبەخشی و ئەینۆشی، هی تۆیە..

ئەوەی بەجێی ئەهێڵی، جێیوت بۆیە...

٢٠٢٢/٨/٣١



بە کردنەوەی دەرگای قوتابخانەکان،

دەرگای دڵم نەکریتەوە..

٢٠٢٢/٩/١



ورەت بەرزبێ، کارت مەیسەرە..

شێرپەنجەشتبێ لە تۆ بەدەرە!!..

٢٠٢٢/٩/١



ورەبەرزی،

شاخت لێەکا بە گردۆڵکە..

٢٠٢٢/٩/١



هەرچی گلەییەك هەبێ چارەسەری ئاسانە،

بەڵام گلەیی کتێب لە هەمووی قورس و گرانترە،

کە نەیخوێنیتەوە!..

٢٠٢٢/٩/٦



ئەوەندە بەجێبهێڵە کە خەمی بۆ نەخۆی،

یان نەبێتە شەڕی دوای خۆت..

٢٠٢٢/٩/٦



لە خەڵکی خراپ وەچەی باش نابێت،

ناشێ لە دڕکیش گوڵی جوان بێت!..

٢٠٢٢/٩/٧



خوێندنەوە نەبوایە،

لە خواردن کەوتبووم!..

٢٠٢٢/٩/١٠



جێی داخە، چاوەڕێی مەرگمان ئەکەن،

بۆ ئەوەی پیامانا هەڵبەن!!

٢٠٢٢/٩/٢٤



نەبوونی،

منی کردە خاوەن بوون!..

٢٠٢٢/٩/٢٥



هەموو رۆژێکی داهاتوو،

ئەکەمە مامۆستای ئەمڕۆ..

٢٠٢٢/٩/٢٥



وەچە،

سەنگی دایكو باوکە!!



گەورەترین سامانی مرۆڤ،

دڵنارامییەتی!!

٢٠٢٢/١٠/٤



شانازی بەوەوە ئەکەم،

گەر بشمرم، هەر زیندووم!

٢٠٢٢/١٠/٦

ژیان،

بە کۆڕو کۆمەڵەوە خۆشە..

٢٠٢٢/١٠/٧



ئەو مرۆڤانەی،

لە چاکەیا کەموێنەن،

حەیفە زوو بمرن!!

٢٠٢٢/١٠/٧



هەرکەسێ هەواڵم ئەپرسێ،

ئەڵێم ئەگەر خراپ بیەڵێ باشم..

٢٠٢٢/١٠/٧



ژیان وێنەیەکە،

بە تێگەیشتنی مرۆڤەکانی..

٢٠٢٢/١٠/٨



گورگ ئەگەر گۆشتی دەست نەکەوێ،

قەپاڵ لە خۆی ئەگرێ!!

٢٠٢٢/١٠/١٧



کوردستان نێچیرێکە،

لە ژێر کەڵبەی دڕندەکانا!

٢٠٢٢/١٠/١٨



ماڵی بێ گەورە، کلکی بێ تەورە!!



هەموو گیانلەبەرێك،

گیرۆدەیە بە بژێوی ژیانیەوە!



ئەو کەسەی بە هەوانتە بژی،

بە هەوانتەش ئەمرێ!

لە مەرگی کەڵەهونەرمەندێکا، ئەم وتەیەم بەرهەمهێنا:

لە دارمانی پایەکانا،

سەقف هەرس ئەهێنێ!

٢٠٢٢/١/٢٠



گەورەیی پەروەردگار،

لە جوانی گیانلەبەراندایە!

٢٠٢٣/٤/٧



لە داری بێبەر،

چاوەڕێی بەر مەبە!



بۆ خۆشییەکی کاتی،

تەندروستییەکی هەمیشەیی لەدەست مەیە.



ئامۆژگاری باوکم:

ئەگەر ئیشی بەڕێوەبەری پۆلیست هەبوو،

دەرگاوانەکەی بناسە.



هاوڕێی گەشت زۆر گرنگە،

بزانە کێ هەڵئەبژێری!



ئاو ئاو ناخنکێنێ

ئاگر ئاگر ناسووتێنێ

بەڵام مرۆڤ ئاگرو ئاوە

پێچەوانەکەی بەدەستدێنێ

٢٠٢٣/١٠/١٠



هەموو زیندەوەرێك،

بژێوی ژیانی هەیە.

٢٠٢٣/١٠/١٨

ژێرمان نەوتە،

سەرمان چەوتە.

٢٠٢٣/١٠/٢٣



داری بەردار بەردی تێدەگیرێ،

نەتەکێنرێ، نەوەرێنرێ،

بە داریش نەمێنێتەوە!

٢٠٢٣/١٠/٢٤



**ژیان سینەمای خوایە**

**هەموو فیلمێکی تیایە**

**ئەوەی ئەڵێن ڕەوایە**

**لای هەندێک ناڕەوایە**

٢٠١٩/١٢/٢٠



**بۆ پیاو لە سەروو حەفتاوە...**

**کە (دەعبات) بوو بە دیکۆر**

**گوێت گران ئەبێ لچ شۆڕ**

**نەکەی هەوڵی جووتبوون بەی**

**نەبا خۆت بکەی تیرۆر**

٢٠١٩/١٢/١٩



**﴿جێماوەی باوك، یادگاری وەچەیە﴾**

وەرەسە نابێ بە کەرەسە

قـەت بـەوە نالـێـم کەسە

ئــەوەی چاوی لـەوەبــێ

مـن پێیئەڵـێـم تەرەسە

٢٠١٩/١٢/٢٠



**کۆرۆنا..**

لـێمگـەڕێـن بـڵـێم نـا نـا

بـۆ ڤـایـرۆسـی کـۆرۆنـــا

بـە پارێـزی هەڵوێسـتمان

ئـەو ڤـایـرۆسـەمـان راونا

٢٠٢٠/٤/١٦



داری بەردار بەردی تێئەگیرێ

مرۆڤی بەرهەمداریش تـوانج

لە نێو ئێمەی کوردا هەر وابووە

بـۆیـە نـایـەڵـن بگـەینـە ئامانج

٢٠٢٠/٥/٨



بڕگە شیعر:

لە سایەی حیزب و حوکمەت

نـە حەیـا مـا نـە حورمـەت

چی مـاوە بێ بـە قیسـمەت

مەمکە چرچەکەی عیسمەت

تـۆ بڵێی عیسـمەت مابێ

تـا مـابێ ئـەبێ چـابێ

ئاغاو مبدیا حسێن



هەر هەوڵ ئەیەم کە تووڕە نەبم

بـەڵام ناتـوانـم دەبـا هـەر نەبم

مرۆڤ نەتوانی کاری مەیســەرکا

لە خۆی بپرسـێ من بۆچـی ببم؟

(زاڵنەبوون بەسەر کردارا)..

٢٠٢٠/٩/١٢



هەنـدێ داوێـنە ئەبـێ بە دوژمن

کـە بـەدەر نییـە لـە مـناڵ و ژن

هەموو هەوڵێکیش هەر بۆ ئەوانە

بـەخـۆت نـازانی لـەپـڕ ئەتکـوژن

٢٠٢٠/٩/١٣



وەرزی پـایـزە گـۆیـژ پـەیـابـوو

گەرماکەی هاوین ئەمڕۆ بەسەرچوو

ساڵ دوانزە مانگە برا چـوار وەرزە

تەمەنیش وەرزە هاکا لەدەسـتچوو

(چاوم بە عارەبانەیەکی گۆیژفرۆش کەوت)

٢٠٢٠/٩/٢١



ژیـان نـێـوانـی دوو سـفـرە

خاکبەسەر هەر ئەهلی کوفرە

گەر کەسێکی خواپێداوبووی

خـۆت بکـەرە خـاوەن سفـرە



کە زەختو شەکرە خزایە جەستە

مرۆڤ داماوە هەمیشە پەستە

تەندروست باشبی خاوەن دەوڵەتی

ئەتوانی بڵێی دە ئیتر بەستە

٢٠٢٠/٩/٢٤



لە سیمای دایکیا کچیم بەدیکرد

سەرنجملێدا لێیڕوانیم ورد ورد

ئەمیش کاتی خۆی شۆخێکی شەنگبوو

زوڵمی رۆژگارە وا غەدری لێکرد

(وتراوە دایك ببینەو دوێتە بخوازە)

دایكو کچەکەی هاتنە دوکانەکەم..

٢٠٢٠/٩/٢٤



پەروەردە مەکەن منالّتان بە ناز

کاتێ گەورەبێ بۆتان ناکرێ ساز

رەوشتی جوان و رێنمایی بەجێ

نایەڵێ منالّ لەدەستان دەرچێ

٢٠٢٠/٩/٢٤



لە تاریکیا دڵم ئارامە

تاکو نەزانم کامەیە کامە

جیاوازی نەکەم لە رەش و سپی

ئەوساکە ناڵێم برینم زامە

٢٠٢٠/٩/٢٨



سلێمانی.

هەر شوێن پێیەکت شوێنەوارێکە

هەر جێ بستێکت یادگارێکە

لە هەڵوێستی جوان قەت دانەبڕاوی

سلێمانییەکەم عەجەب شارێکە

٢٠٢٠/٩/٣١



هەتا ئەتوانی لە خەفەت راکە

ئەوەی کە نایخوا لە ژین بێباکە

خەفەت کوژەری جەستەی مرۆڤە

هەرچی هاتەپێش بەشی خوای تاکە

٢٠٢٠/١٠/٧



**پیـری،**

**هـەر دائـەنـیـشـم، خـەو ئەمبـاتـەوە**

**خـــەوێ نـابـیـنــم، لام لـێـکــاتـــەوە**

**دەردی پـیـریـیـە، جـەسـتـە بێـهێـزە**

**تەمەن بەسەرچوو، مەرگ ئەمباتەوە**

**﴿تەمەن حەفتاو شەشە﴾**

**٢٠٢٠/١٠/٧**



**هـەوای پاکتبـێ لە ژیـن مەترسـە**

**بۆ پاکی ژینگە هەمووان بەرپرسە**

**خۆت مەخـە داوی پیسـیو پۆخڵی**

**کـاتـێ ئـەزانـی ئـاوێـتـەی گـڵـی**

**٢٠٢٠/١٠/١٠**



لە بێکەسیدا گەڕام بۆ کەسێ

کە گوێم لێبگرێ هەواڵم پرسێ

بڵێ ئاغا گیان لە دوای چی وێڵی؟

دوای خەڵکی ئەمڕۆو لە فرۆفێڵی؟

٢٠٢٠/١٠/١١



سکاڵای دڵم خستە سەر کاغەز

وتی بنووسە لە داخی ناحەز

ئەوەی کە دۆستتە بە تەنها منم

ئەوانی تریش دەستیان بە گونم

٢٠٢٠/١٠/١٢



**بۆ پەروەردگار...**

**تەمەن ئەبەخشی گەورەمان ئەکەی**

**لە تاڵی ژینا نغرۆمان ئەکەی**

**کەس هەیە بڵێ بۆچی وا ئەکەی؟**

**پاداشت ئەوەیە لە ژین دەرمانکەی؟!**

٢٠٢٠/١٠/١٢



**ژیان بریتییە لە مرۆڤدۆستی**

**ئەگەر وانەبین بڕاوە پۆستی**

**خۆشیو ناخۆشی بەشی هەموانە**

**هاوبەشی یەکبین ئەکەوێ کۆستی**

٢٠٢٠/١٠/١٥



پیری وەهایکرد دوا پێکم جێهێشت

وتم وا دیارە ژیانم جێهێشت

کۆتایی ژیان لە دوا پێکدایە

بنێشت جونێکبوو چێژم لێ نەچێشت

٢٠٢٠/١٠/١٧



ژیان زۆر کورتە بە خۆش رایبوێرن

کەمیشتان هەبێ وابزانن تێرن

نەکەن بۆ (مادە) سەرتان نەویکەن

ئێوە مرۆڤن، بەرێزن، شێرن

٢٠٢٠/١٠/١٧



وره‌ت بەرزبێ شاخ ئەکەی بە گرد

سـەرنـج بـدە لێم تێبگـە بە ورد

هەر کارێ لە ژین بۆت هاتەپێشێ

ئاسـان وەریـگـرە دڵـت نـەێـشـێ

٢٠٢٠/١٠/١٨



ئەم ژیانـەی تێیدایـن گرۆکفێکە

کـە لێـی تێبگـەی بەشـی پفێـکە

نەکەی بە قورسی بیکەیتە کوڵت

دڵی خۆت خۆشکە بەشی ژەمێکە

٢٠٢٠/١٠/١٨



تەمەن سەریکرد بەری لێسەندم
کە بەر نەمێنێ دیارە من بەندم
بێ بەری‌و بەندی سزای ژیانە
سەریشم ناوێ کە هەڵیکەندم

٢٠٢٠/١٠/٢٢



بۆ دەبێ بگرین ئێمە بۆ ژیان
کە دڵتەنگیبێ‌و ناسۆرو گریان
ئێمە کە هاتین گوناهمان چیبوو
پێمئەڵێن ئینسان نەفرەت لە ژیان

٢٠٢٠/١٠/٢٢



بە هیچ کەس مەڵێ رێکە یان پێکە

هیچ نەبێ چایە لەگەڵیا تێکە

بە چرکەساتێ کاتی ئاخاوتن

بۆت دەرئەکەوێ نارێکە رێکە

٢٠٢٠/١٠/٢٦



کە بەرم نەما، سەرم بۆچییە

سەرو بەر نەما، ژینم بۆچییە

وەفای ئەم ژینە بۆ هیچو پووچە

کە هیچم نەما جا کەڵکی چییە

٢٠٢٠/١٠/٢٦



قەناعەت باشە کەمت بێ یا زۆر

کارت مەیسەرکە نەک بۆ چەکمەبۆر

ئەوەی زۆری بوو زۆری بەجێهێشت

هیچی پێ نەبرا جگە لە ناسۆر

٢٠٢٠/١٠/٢٩



هەموو ژیانم لە مەیدا بینی

ژیان بەبێ مەی کوا گرو تینی

کێ دالْدەدەرتە بێجگە لە ساقی

تەنها ساقییە بدا مزگێنی

٢٠٢٠/١٠/٢٩



کـۆرۆنـا وایکـرد ژیـانی لێـتێـکـدام

ژیان چەند خۆشبوو نەیما چێژو تام

تـاڵـیو شـیـریـنـی وا راوەدوونـا

بـوو بە بریـنو ئێـشو دەردو زام

﴿کۆرۆنا ژیانی هەموو جیهانی شێواند﴾

٢٠٢٠/١٠/٣٠



﴿شـاگـرد﴾

شاگرد کە ویستی وەستا شکستبێ

ئەوە دوژمنـە، نەوەک شـاگردبێ

شـاگردی تـەواو رۆڵەی وەسـتایە

ئەمـەکـدار ئەبـێ وەجـاخـزایەبێ

٢٠٢٠/١١/١٢



چاوەڕێی خێربی لەدەستی خراپ

بە چاو نایبینی کە پڕببن قاپ

خراپ خراپە بەخششی نییە

مەنجەڵ بەتاڵە، با نەبێ سەرقاپ

﴿ماڵی بێ ژن گلەیی میوانی لەسەر نییە﴾

٢٠٢٠/١١/١٨



هەندێ متمانە جێگە ناگرێ

باوک بۆ وەچە بێتە راگرێ

ئەگەرچی وەچە خوێن و جگەرە

پاداشتی باوک بوتە ئاگرێ

٢٠٢٠/١١/١٨



شەپازلەی لای راست چەپی تەسلیمکرد

شەقیان تێهەڵدایین، قسەمان نەکرد

شەق و شەپازلە پڕ بە پێستمانە

لاچاو بناوسێ و قنگیش هەمانە!

﴿بەداخەوە کە شەقیان لە مامۆستایەك هەڵدا!!﴾

٢٠٢٠/١١/٢١



نەکەن بێزاربن لە ژین

ئەبێ بۆ خۆتان بژین

رەفتارو بیرتان چاکبێ

بە گوفتاری جوان ئەژین

٢٠٢٠/١١/٢١



هەمیشە چێژی ئەمڕۆم خۆش ئەکەم

چێژی سبەینێم فەرامۆش ئەکەم

ژیان لەلای من ساتەوەختێکە

کە تیایدا ئەژیم تێبگە رۆحەکەم

٢٠٢٠/١١/٢٣



دڵێ زیندووبێ، ئیشقی میوانە

خۆ ئیشقی نەبێ، ئەوە زیندانە

ئەوەی رۆحی بێ ئیشقیشی هەیە

ژین، بە ئیشقەوە تا بڵێی جوانە

٢٠٢٠/١١/٢٣



مادە سەروەربێ مرۆڤ کەرەسە

تەندروستیمان روو لە هەرەسە

کاتێ پزیشک دۆستی گیانی بێ

تەندروستیمان هیچ کەمی نابێ

پێویستە پارە بکرێتە قوربانی مرۆڤ، نەك پێچەوانەکەی،

پزیشك وەك مرۆڤ نزیکترین کەسە لە مرۆڤەوە..

٢٠٢٠/١١/٢٣



ئەشق ببەخشن چێژ لە ژیان بینن

ئێوە مرۆڤن بۆ ژیان هەوێنن

رق و کینەتان دووربێ لە دەروون

لەو روانگەیەوە تۆڵە ئەسێنن

٢٠٢٠/١١/٣٠



لەمـرۆیـا بـژی دوێـنـی تێپەڕی

سبەی چی ئەبێ تۆ بێخەبەری

ژیـانی مرۆڤ هەر ساتـەوەختە

نابێ ژین بکەی بە دەردیسـەری

٢٠٢٠/١١/٣١



زۆرت بەجێهێشـت شەڕی میراتە

لـەجێی پـێـزانـین جنێو خـەڵاتـە

هۆشمەند کەسێکە زۆر جێناهێڵێ

وەچـە جـێـبـێـڵی زەوی بکێڵـێ

٢٠٢٠/١٢/٣



هەر وەرزە سیمای خۆی هەبێ جوانە

هـاویـن هاوینبێ زسـتـان زسـتـانـە

پـایـز پۆشـتـەبی زەخیـرەت هەبـێ

بەهـار بۆ گەشـتە خۆشیو سەیرانە

٢٠٢٠/١٢/٣١



مێشکت ئارامکە بە قومێ قاوە

خەفەتو مەینەت بخەرە لاوە

تەماعی دنیا سـەرقاڵـت نەکـا

ئەبیـتـە کەسێـک دایـم براوە

تێبینی: ماندوێتیم پێوە دیاربوو، لامدایە قاوەخانەیەك

پشویەك بەمو قاوەیەك بخۆمەوە...

٢٠٢٠/١٢/٣١



پێمئەڵێن ئاغا کۆتایی ساڵە

من ئەڵێم برا ژین هەمووی تاڵە

قەت نەبوو رۆژێ دڵم ئارامبێ

ژینم بۆچییە کە هەر خەم زاڵە

٢٠٢٠/١٢/٣١



پێمئەڵێن ئاغا وا ساڵی نوێیە

وتم مەحاڵە کە خۆشی پێیە

روو لە کوێ ئەکەی خۆشی ناهێنێ

مەلەوانیشبی هەر هەمووی زێیە

٢٠٢١/١/١



سکالای دڵم لەسەر کاغەزبێ
بە تەنها ئەوە بە کەڵکی من بێ
رۆژێک تێکەوتووین کە دۆست دەگمەنە
کوانێ بۆنی خۆش کێ گوڵ چەمەنە؟

٢٠٢١/١/١



قەت نەبوو رۆژێک لەخۆم رازیبم
لە ئاستی خزمەت وەکو پێویستبم
ژیان هەر هەمووی ئەبێ خزمەتکەی
کە من وا نەبم بۆچی هەر ببم؟!

٢٠٢١/١/١



مەڵێ ژیان ئەڕوا رەنج بەخەسارین

گەرچی هەوڵئەدەین خزمەتگوزارین

بێئومێد نەبین لەوەی کە ئەیکەین

جێگە دیارئەبین کە ئەهلی کارین

وتراوە (چاکە بکەو بیدە بە ئاوا)،

رێگەی خۆی ئەگرێ ماڵ ئەکا ئاوا

٢٠٢١/١/١



پەیوەندی نێوان باوکو فەرزەندە

کە بوو بە (مادە) بزانە گەندە

سۆزو بەزەیی کاتێ سەروەرە

بە وەچە بڵێی وێنەی گەوهەرە

٢٠٢١/١/٤



هەتا گەنجی ئەڵێی هەمە

کە پیریشبووی ئەڵێی خەمە

هەتا پێتبێ ئەڵێی کوڕی

کە پێشت نەما هەروەکو تڕی

٢٠٢١/١/٥



بەڕێدا ئەڕۆم هەردوو قاچ سڕە

پێمئەڵێن عومەر بۆچی وا وڕە

پاداشتی ژیان پیری خەڵاتە

گەنجیم بەسەرچوو کوانێ ئەو گوڕە

٢٠٢١/١/٦



رەفتـاری گەورە بەرامبـەر منـاڵ

ئەبێ شیرینبێ نەوەک زبرو تاڵ

مناڵ هەویرە شـێوەی لێپێکدێ

گـەورە بەرپرسـە کە بیپـارێـزێ

٢٠٢١/١/٦



زۆرت هەوڵدا زۆرت بەجێهێشـــت

بۆ خۆشی ژیان هیچت لێنەچێشـت

پێـویســتـە مـرۆڤ هێـندە هەوڵـدا

دەرفەتی بێ، وەک جوینی بنێشت

٢٠٢١/١/٤



چیماوە لە ژیان بەندی ئەبەدی

رەنجی فەرهادم لێهاتۆتەدی

چەندە هەوڵمدا نەگەیمە مەبەست

جیا نەکرایەوە چاکە لە بەدی

٢٠٢١/١/١٠



چاوانم گیرا نەمدی دڵخۆشکەر

چەترێ نابینم بۆ سایەو سێبەر

ئیتر مانای چی پێمبڵێن بەشەر

ناحەقمە بڵێم سەد خۆزگەم بە کەر؟

٢٠٢١/١/١١



رۆژێکم نەدی ناحەق نەبینم

ناحەقم مەگرن گەشتۆتە تینم

چ ڕەوای حەقە ژیان ناحەقبێ

لە ناحەقیا چۆن حەق ببینم

لەم رۆژەیا دوو ناحەقیم بەدیکرد:

١- پیاوێکی بەتەمەنی ژنداری ناسیاو ژنی دووەمی هێنابوو، کە لە بازارا ئەیگێڕاو کەشخەیی پێوە ئەکرد، پیاوەکە تەمەنی لە پەنجاکانابوو، ژنە تازەکەش هەروا بیستساڵێك ئەبوو.

٢- کوڕێکی گەنج ئافرەتێکی بەتەمەن خێزانی بوو، بە پێچەوانەی خاڵی یەکەم!..



**لەگەڵ نەفاما مەکە گفتوگۆ**

**نەبا بە هەڵەی ببی دەسخەڕۆ**

**وازی لێبێنەو فەرامۆشیکە**

**باش لێم تێبگە لەسەری مەڕۆ**

**٢٠٢١/١/١٧**



**ولاتی بێ سەروبەرە**

**گەر شاییشبێ شایی کەرە**

**چاکەکار لە شار بەدەرە**

**لە قوزیاکی خراپ بەرە**

(گوزارشت لەمرۆ نەکا)

**٢٠٢١/١/٢١**



کە ژن بۆڵەیکرد هەردوو گوێت کەڕبێ

باشترین رێگە کەوا چەنگ نەبێ

ئەو هەر برێسێ تۆش تەشیرێسبی

کاتێ ئەزانی خۆی بێدەنگ ئەبێ

٢٠٢١/١/١٤



سەرت بە پاشایی بگا

ژیانت ببێتە یەک نیگا

ببیتە خاوەنی جێگا

مردنت هەر دێتە رێگا

تێبینی: ئەمڕۆژە جۆ بایدن بووە سەرۆکی ئەمەریکا،

ترامپیش کۆشکی سپی جێهێشت..

٢٠٢١/١/٢١



هونەرو ئەدەب بە پارە نەمکرد

چی خواستم هەبوو تیایا بەدیمکرد

ئەگەرچی ئەمڕۆ پارە دروشمە

لە ئاست هەڵوێستما سەری نەویکرد

٢٠٢١/١/٢٢



رەخنەم لە خۆمە دڵم ناسکە

ژیان پڵنگە بەندەش ئاسکە

دیارە بەشی من لە ژیان وایە

ناحەق لەپێشەو حەق نارەوایە

٢٠٢١/١/٢٦



**بۆ کاسبکاران...**

**کڕیـار تاجێکـە وا لەسـەر سـەرە**

**کڕیار سـوڵتانە قسـەی گەوهەرە**

**کە تۆ بەشەربی ئەویش بەشەرە**

**ڕێزی لـێنـەگری بـرا خـەتـەرە**

سوودم لە (گاندی سەرۆکی هیندستانو ڕزگارکەری هیند لەدەست ئیمپریالیزم فەرموویەتی) وەرگرتووە.

٢٠٢١/١/٢٨



**خەفـەتی (ئەولاد) وەچـە کـوژەرە**

**هی کەسوکاریش وەکو نەشتەرە**

**هەرکەسـێ کـەوا لێیان بەدووربێ**

**لای من هەر تەنها ئەو بەختەوەرە**

٢٠٢١/١/٣١



ئەبێ گرێکوێرەی ئەدەب بکرێتەوە

پەردەی شەرم لەسەری هەڵبدرێتەوە

لەڕێی ئەدەبەوەیە کە ئەیسەلمێنین

کورد هەیەو مێژووی ناسڕێتەوە

٢٠٢١/٢/٢



خەندەی سەر لێوت نوێنەری دڵتە

خەفەتو مەینەت ئاوێتەی گڵتە

هەتا ئەتوانی خەفەت بەباکە

لە دەردو ناسۆر برادەر راکە

٢٠٢١/٢/٢٤



**هەرچی ئەبینم هەواڵپرسمە**

**زویرکردنیان جێگەی ترسمە**

**دیارە ئەبێ من خزمەتگوزاربم**

**لە ئاست ئەوانا کەسێکی دیاربم**

٢٠٢١/٢/٢٦



**هەرچی ئەبینم شێوەی شێواوە**

**خۆزگە ئەخوازن بڕواننە دواوە**

**بۆچی هەر ئەبێ رابوردوو باشبێ؟**

**بەڵام داهاتوو سەخت و دژواربێ؟**

تێبینی: ژیانیان لێشێواندوین، خۆزگە بە رابوردوو ئەخوازین، چاوەڕێش ناکەین داهاتورمان لە ئێستامان باشتربێ، وتراوە: (هەموو ساڵ خۆزگەمان بە پار)..

٢١٢١/٣/١



نەنگە کە مرۆڤ لە خۆی بگۆڕێ

با چاک بزانێ لە ژین ئەدۆڕێ

لەخۆباییبوون پیشەی دەبەنگە

مرۆڤی ڕەسەن بەکێش و سەنگە

٢٠٢١/٣/٢



پارە بوو بە بژاردن

تیرە ئەیدا لە گەردن

هەر شت زیاد لە پێویستبێ

کوژەرە بۆچی ببێ؟!

تێبینی: لەگەڵ ئەو پەندەیا نیم کە ئەڵێ (ماڵی زیایە سەر ناشکێنێ)، من ئەڵێم سەرت قاڵەکاو تێکت ئەشکێنێ.. لام وایە ئەمە دووەم جارە ئەم بابەتە ئەدرکێنم...

٢٠٢١/٣/١٤



تەڕاییم نەما جوان بلاوێنم

غیرەت نەماوە لەکوێی بهێنم

سەد نەمامی جوان بێتە بەردەستم

چۆنی بڕوێنم؟! چۆنی بچێنم؟!

٢٠٢١/٣/١٥



لە پیریا من شانسم هەستاوە

ئەو هەموو جوانە دەورەمیان داوە

پیری بەزانمی پووام وەک پەڕۆ

هەموو هەستێکی جوانیم تۆراوە

٢٠٢١/٣/١٧



هەرچی ئەبینم شێوەی شێواوە

خۆزگە ئەخوازێ بەوەی نەماوە

بۆ ئەبێ ژیان وا ترش‌و تاڵبێ

خەم‌و ناسۆری لەسەرمان زاڵبێ

٢٠٢١/٣/١٧



نە کرێچیبی نە کرێچیتبێ

هەردوو بە قوربان ساقەسەرتبێ

ئارامی مێشک دەوڵەمەندییە

لە ژین گەیشتوویت هۆش‌و بیرتبێ

٢٠٢١/٣/٢٢



بێئۆقرەییە ئەم ژینە تاڵە

ژین بەردەوامە ساڵەهای ساڵە

هەندێ چزودار وەک زەردەواڵە

هەر پێوەئەدا ئەمە کەی حاڵە

٢٠٢١/٣/٢٣



بەرهەم بەدەستی خۆت بێتە کایە

ئەوە سامانە کۆتایی نایە

باوەربەخۆبوون بەرهەمهێنەرە

بۆ کەسایەتی جێگەی جێندەرە

(جێندەر هەردوو رەگەزی نێرو مێ)

٢٠٢١/٤/٤



لە پرسینەوەی ژیان بترسە

چونکە هەموو کەس تیایا بەرپرسە

راستی رەوتتبێ لە ژین هەتا هەی

سەربەرزو رووگەش لە هیچ مەترسە

(ئەتوانین بڵێین رووسوور)

٢٠٢١/٤/٦



کوردی دەروونپاک سپی وەک لۆکە

لای هەندێ ئیمام بووین بە جنۆکە

ئەو کە تۆی ناوێ بۆ تۆ ئەتەوێ

رۆژێ زووتربێ لە دینی راکە

٢٠٢١/٤/٨



هێندەی کاری خۆت بەرزی دەستدێنی

بەرزی دەستنایە بێ شەونخوونی

کە تێنەکۆشی بەرزی دەستبێنی

تەمەن بەسەرچوو چۆن بەرزی دێنی

ئەم چوارینەیە لە شیعرێکی شاعیری ناوداری عەرەب (موتەنەببی)یەوە رەچاوکراوە کە ئەڵێ:

بقدر الكد تكتسب المعالي

ومن طلب العلا سهر الليالي

ومن رام العلا من غير كد

أضاع العمر في طلب المحال

٢٠٢١/٤/١٦



**یەکتاپەرستی..**

**پـەنـامان هـەر پـەنـای خـوایە**

**خـواوەنـد دەرمـانـە دەوایـــە**

**هـێـزێـکـە قـەت لـە بـن نایە**

**ئەوەش هەر خوایە هەر خوایە**

٢٠٢١/٤/٢١



**هەتـا ئەتـوانی پشـت بەخۆ بەستە**

**ئەوساکە بڵێ هەموو کەس کەستە**

**ئەوەی ئەتـەوێ کە لات مەبەسـتە**

**دێـتـەکـایـەوە حـازر بـەدەسـتـە**

٢٠٢١/٤/٢٣



بە یەکێتی گەل ماف بەدەستدێنی

بۆت دەرئەکەوێ کە تۆش هاوخوێنی

دوژمن ناتوانێ دەلاقەت تێکا

مافت ئەسێنی ناحەز بەزێنی

ڕۆژی بۆمبارانی قەڵادزێ، ساڵی (٧٤) خۆم لە ناو ئەو کارەساتەیا بووم.

٢٠٢١/٤/٢٤



لەگەڵ ئێوەمە ئەی بەنی بەشەر

ڕێزو بایەختان هەبێ بۆ هونەر

هونەر بە گشتی پێناسەی تۆیە

دوڕڕە یاقووتە ئەڵماسە گەوهەر

٢٠٢١/٤/٢٧



**توخوا خەڵکینە خەفەت هەڵمەگرن**

**ژیـان بەڕێـکەن با بەرگـەی بگـرن**

**خـەم و پـەژارە دادی کـەس نـادا**

**هەتـا ئەتـوانـن ڕێـزی یەکبـگرن**

٢٠٢١/٥/٦



**هەرچیـم پـەیـاکـرد لـێـم بـوو بـە زایـە**

**دواجار بۆم دەرکەوت کە هەمووی زیایە**

**هـێـنـدە هـەوڵـدەن زیـایـەتـان کەمبێ**

**چـونـکـە تـەمـەنیـش ئـەڕوا بەزایـە**

٢٠٢١/٥/٦



گـۆڕسـتـان پـڕبـوو جێـگە نـەماوە

شـەڕی خـۆتـرێـن لـە ژیـنـا مــاوە

چەندە هەوڵدەین مەرگ ئەچێـژین

بۆ خۆشەویستان فرمێسک ئەڕێژین

(لە سەردانی گردی سەیوانا، بۆ سەر گۆڕی ئازیزان)

٢٠٢١/٥/٨



سکـالأم بــردە لای پــەروەردگـــار

ژینی پێبەخشیم تاڵ وەک زەهری مار

ئـیـتـر بـۆ ئـەبــێ سـزای گـۆرمـبێ

کـێ خـەتـابــارە کـێـیـە تـاوانــبــار؟

٢٠٢١/٥/١٧



هەرچیت بەسەربێ مەیکە بە کێشە

خەفەت وەدمرنێ لە رەگ و ریشە

ژیان وەهایە قەت نییە باری

چاکەی تیا بکەی کەسێکی دیاری

٢٠٢١/٥/٢٠



گەر بە چاوی من سەیری دنیاکەن

باوەڕم وایە خراپە ناکەن

چاوێ خراپەی پێ خراپ نەبێ

کوێرایی دابێ هەستی پێبکەن

٢٠٢١/٦/٢



کۆی مەکەرەوە ببی بە حەرەس

ئەبێتە خواردەی گەوادو تەرەس

هەتا ئەتـوانی بیـخۆو ببەخشـە

با نەتسـووتێنێ بتکاتە قەقنەس

٢٠٢١/٦/٧



شـارم وێـرانـبـوو کـرا بـە گـەراج

چـی شـوێـنـەوارە وا کـرا هـەراج

ئیـتـر کوێ هەیـە جێـی شـانازیمبێ

کلتوور کەلەپوور گشت درا لە خاچ

(لە کاتێکا یەکێ لە خانووە دێرینەکانی شار چەکوشـی رووخێـنـەری لەسـەربوو (دقاق)، کـپە لە دڵمەوە نەهات، پرسـیم بۆ نـەیرووخێنن؟ وتـیـان نەیکەین بە گەراج)..

٢٠٢١/٦/١٣



راستە کە ژیان دەریای بێئاوە

ئەوەی راستبکا تیایا خنکاوە

مەلەوان ئیمرۆ رۆڵێکی نییە

ناکەسبەچەی زۆر وا لەبەرچاوە

٢٠٢١/٦/١٣



کڕیاری ئەمڕۆ وەکو مێش وایە

یەکێ نیشتەوە دوانی لەدوایە

دیارە ئەم ژینە چاولێکەرییە

لە هەر شتێکا بوتە پەتایە

(نەبێ کڕیار هۆشمەندبێ بزانێ مامەڵە لەگەڵ کێ نەکا بۆ ئەوەی تووشی هەڵخەڵەتاندن نەبێت)..

٢٠٢١/٦/٢٤



ژین بێـوەفایە یاخود خەڵـکەکەی؟
وەڵامم بـەرێ ئەگـەر راسـتـەکەی
ژیـان وەک خۆیـە هیـچ نەگۆڕاوە
بێئـەمەکی خەڵک تیـایا خوڵـقـاوە

٢٠٢١/٧/١



شـەرمەکەم کەوا بڵێم من کوردم
حیـزبی خـۆفرۆش وا حەیای بردم
بەخۆی ئەڵێ کورد، سیخوڕی ئەکا
پیـاوی بێـگـانـە لـە داخـت مـردم

٢٠٢١/٧/٢٨



ولاتــەکـەی مــن پــڕ بـەرەکـەتـە

بەلام ئەڵـێـی چـی خەڵـکی شـەکەتـە

یـەکپـەسـەنـدکـردن لامـان مەحاڵـە

خەتی وەک شێرەو شێریشمان خەتە

٢٠٢١/٧/٣٠



با زۆریش نەبێ سەروەت و سامان

تەسلیمی مەبن ئامـان سـەد ئامان

هاتینە ژیـان دەسـتمان بەتـاڵـبوو

ئەوەندە بەسـە بەڕێـکـەین ژیان

٢٠٢١/٨/٢



هەر رۆژێ هەڵسام رۆژێکی نوێیە

ئاخۆ ئەم رۆژەش چی زیادەی پێیە

زیاد لە دووبارە هیچیتر نەبوو

کەسێ وریابێ چاک ئاگای لێیە

٢٠٢١/٨/١٠



بۆ پەروەردگار..

چیت پێبەخشیم چیت پێچێشتم

دەردی ژیانت چۆن پێرِشتم

هەر نەبوومایە کۆڵێ باشتربوو

هەرچیشت دامێ بەتاڵە مشتم

٢٠٢١/٨/١٧



بزانە ژیان راکەراکەیە

بەرهەمت هەبێ تەنها چاکەیە

رۆژگار هەر ئەڕوا بەرەو کۆتایە

کۆتایی هەمووان بۆ ئەو خاکەیە

٢٠٢١/١٠/١٨



باوک هیلاکە ئەکا جرت و فرت

بۆ ژن و منالْ ئەیانکا بە خرت

منالْ گەورەبێ دایک پشتی گرت

بەشی باوکیشیان زیاترنییە لە جڕت

٢٠٢١/١٠/٣٠



ژیان سەختە دوور لە ساختە

گەرچی پێچەوانەی ناختە

درێغ بۆ رۆژێ تێکەوتووین

رووبکەینە کوێ بڵێین پوختە

٢٠٢١/٣/٣



خەم لێمناگەڕێ هەروا لە کۆڵم

دۆست کەم ئەبینم ئاوێتەی چۆڵم

بێ دۆستو ئاوەڵ ژین سەرابێکە

ژینی تیا نییە مایل بە خۆڵم

٢٠٢١/٣/٣



بزەی سەر لێوان بۆچی تـۆراوە؟

خەڵکی ئەبینـم لەخـۆی گـۆڕاوە

زوڵمی زەمانە کارێـکی وایکـرد

ئەسڵزایەکان هەروان لە دواوە

٢٠٢١/١٢/١٧



بەندە شەوی یەڵدام بەم شێوەیە بەسەربرد:

ئەمشەو دانیشـتم شەوی یەڵدابوو

مەزەی خواردنم شێلمی کولاوبـوو

بە تەنها شـتێ دڵ پـێـی ئـارامبـوو

هەورەتریشـقەو لێـزمـەی بارانبوو

٢٠٢١/١٢/٢١



قـۆڵـی خێـزانـم نـەدی لـە قـۆڵـما

هەمـوو ژیـانیـشـم بۆ یا بە کۆڵما

ئەوە جێـی داخە ژینم خۆش نەبوو

زووخاوەسکبووم سوێ چوو بە دڵما

٢٠٢٢/١/١٣



رەنگە کە جوانی ببێتە دوژمن

سـامـان لـە پاڵـیا نەبا بتکـوژن

کە جوانیو سـامان هەراسانتکا

چاکتر وەهایە کە هیچیان نەبن

٢٠٢٢/٢/٢٠



دڵم ئەسووتێ بە گەنجی ئەمڕۆ

بە وەعدی درۆ ئەبن دەسخەڕۆ

هەندی جار گەنجی هەڵەت پێئەکا

ئەبێ هوشیاربی لەسەری مەڕۆ

٢٠٢٢/٢/٢٠



نەشتەرگەریمکرد جنس هێزی نەما

کە کۆرۆنامگرت سمێڵیش نەما

دڵ بە چی خۆشکەم ئەو دوانەم نەما

ئیتر پێمبڵێن عومەر بۆچی ما؟

٢٠٢٢/٢/٢٦



باریێ نەتـتـوانی مەچـۆرە ژێـری

خێریشی تیابێ گـووبکەرە خێـری

مرۆڤ کە جەستەی لە ئەستۆدایە

خـۆپـارێـزیـبێ خێـر لـەوەدایـە

مـانای چواریـنـەم زۆر ئـاشـکرایـە

ئەگەر تێینەگەی هەڵبەت خەتایە

٢٠٢٢/٢/٢٨



بەدەست ژینەوە دیلو ئەسـیرم

لە تێگـەیـشتـنی ئـەڵێم خەبیرم

لە هەڵسوکەوتا بەرزیو نشێوبوو

هەرچـی هـاتـەڕێـم ناچێ لەبیـرم

٢٠٢٢/٣/١



**هەرچی ئەبینم لام بێتاوانە**

**چونکە گیرۆدەی ناسۆری ژیانە**

**کەسێ نابینی شادو بەختەومر**

**ئەوەی هۆکارە تەنها ئینسانە**

٢٠٢٢/٣/٧



**خەڵکێ ئەبینم ماتو مەلوولە**

**لەگەڵ ئەوەشا زۆربەی عەجوولە**

**ئەوەی کە راستە هەروا لە دواوە**

**بێ بار بێ هەڵوێست هەمیشە فوولە**

(فوول) وشەیەکی ئینگلیزیە، واتە قەپات، پڕە..

٢٠٢٢/٣/٣



سەرخۆشی نەبێ ژیان خامۆشە

هەر سەرخۆشییە ژینی لە کۆشە

ئەگەر ئەتەوێ لە ژیان تێبگەی

لێی خافڵ نەبی هەر مەی بنۆشە

٢٠٢٢/٣/٥



وا سی‌و دوو ساڵە کورد حکومەتە

بۆ حوکمڕانی سسست‌و شەکەتە

هەندێ کە خاوەن پلەو پایەیە

بۆ خۆی هەر ئەدزێ بووە بە چەتە

٢٠٢٢/٣/١١



خـۆت بـپـارێـزە نـەکـەی هـەڕەشـە

پـاداشـتی نـییـە لـە ژیـن بێبەشە

هەرکات ئەتەوێ رێز لە خۆت بگری

ئـەوسـاکـە تـامـی ژیـنـت بـنـۆشـە

٢٠٢٢/٣/١٢



کە دەستت ڕۆیی هەڵەی پێمەکە

نەک خوانەکردە بۆت بێتە لەکە

دەستتڕۆی ئەقڵی تیا بەکار بێنی

لە خراپ دووربی باشـترین چەکە

٢٠٢٢/٣/١٥



**تایبەتە بۆ پیاوی پیر...**

**دەستت خستە پشت بۆ مل پاقلاوە**

**زۆر چاک بزانە هێزت نەماوە**

**دەردی رۆژگار وا پیری کردووی**

**پاداشتی ژینە بۆمان جێماوە**

**پاقلاوە: چرچ و لۆچی پشتەملە..**

**٢٠٢٢/٣/٢٣**



**لە بوونا بەخشین لەبیرت نەچێ**

**ئەبێ وریابی بەخێرۆ ئەچێ**

**ئەوەی ئەیبەخشی ئەبیە خاوەنی**

**کۆی بکەیتەوە لەدەست دەرئەچێ**

**٢٠٢٢/٤/٥**



ئـەوەی حـەزبـکـا دوژمـن بـێـتـەوە

شـەو کە نوسـت رۆژی لێنەبێـتـەوە

ئەگەر راست ئەکەن یەکتر قبوڵکەن

دوژمـنــی نـاحــەز ئـەڕەوێـتــەوە

٢٠٢٢/٤/١٧



داوام لە خوایە کـەوا بمکـوژێ

زووخاوی ژیان بە سەرما نەڕژێ

گوناهـم نـەبـوو هاتـمـە ژینـەوە

بـۆ نـارەوایـی پـیـامـا هەڵـپـژێ؟

٢٠٢٢/٤/٢٢



## کورسی..

کورسیم داناوە بۆ سڵاوو ڕێز

بۆتە سەرچاوە بۆ توانام و هێز

هەر کەس ئەبێتە خاوەنی کورسی

ئەبێ لێببڕژێ وەک کانیو کارێز

٢٠٢٢/٤/٢٣



## کورسی..

ئەوەی ئەنازێ بە پلەو کورسی

ئەبێ تێبگا بۆتە بەرپرسی

بەرپرسیارێتی مرۆڤ وەهایە

چاکەی پێبکەی لە کەس نەترسی

٢٠٢٢/٤/٢٣



عەدالـەت نەمـا لای زلهێزەکان

چی نـارەوایە بۆمانیـان خوڵقـان

پاداشتی خەڵکی چـۆن ئەبێ وابێ

بێزارم لەوەی پێمبڵێـن ئینسـان

٢٠٢٢/٥/٨



ئـەو شتەی نیتـە هـەوڵی بۆ ئەدەی

کاتـێ کە ئـەتبێ بۆ لێـی رائـەکەی؟

هەر کاتێ ویستت خۆت رسوانەکەی

قـەنـاعەتتبێ کـاری چـاک ئـەکەی

٢٠٢٢/٥/٨



خـەڵـکـە ئـەمـەوێ بـە پێـوە بـمـرم

نـەک نـەخـۆشکەوم جێـگەیـە بگـرم

لە ژیانما نەمویست کەس ئازاربدەم

مـردن لـە رێـیـە مـەبـنـە رێـگـرم

٢٠٢٢/٥/٩



گەزی چیو جاوی چی؟..

بولبـولم نەمـا بیـخەمە قـەفـەز

جاویش نـەماوە بیپێوم بە گەز

باخی بەردارم هەمووی وشکبوو

بیر ناکەمەوە لە بەرهـەمی رەز

٢٠٢٢/٥/٩



**وازم لێبێنن با ئیتر بمرم**

**ژیانم تاڵە بەرگەی ناگرم**

**مرۆڤی هەستیار بەختەومرنابێ**

**هێزم نەماوە لەدەستچوو گورم**

٢٠٢٢/٥/٩



**جوانی لای ئێمە هەر دەموچاوە**

**ناخ بەدیناکەین لێرە وا باوە**

**جوانی گەر هەبێ لە دمروونداپە**

**رووکەش هیچ نییە گرنگی ناوە**

٢٠٢٢/٥/١٠



کامڵ کەسێکە کەوا هەستیارە

لە هەڵسوکەوتا کارجوان و دیارە

وشەی کامڵبوون بەرگی بەرێتی

لەسەرخۆ ئەبێ نەک بڵێن هارە

٢٠٢٢/٥/١١



خۆشەویستی خەڵک..

دەرمانی مـن ئـەو خـەڵـکەیە

خـۆشـم نـەوێـن لام هـەڵـەیــە

مـرۆڤ بـە تـەنـها ژینـی مـەحاڵە

سەرتاپای ژیان هەمووی گەمەیە

٢٠٢٢/٥/١٢



ئەگەر ئەتـەوێ پێتبڵێن بەشەر

لەسەر میراتی نەکەی بکەی شەڕ

میراتی موفتـە بـۆی هیلاک نابی

وەچەی لەباربی ئەبێتـە گـەوهەر

٢٠٢٢/٥/١٢



(وتراوە لـە نێوان خۆشەویستانا پەردەی شەرم نامێنێ، نێربـێ یـان مـێ..

بەندە بۆ فاتم ناوێ کە خۆشمئەوێ..)

هـەر هاتی فاتـم ماچێـکـم بـەرێ

هەمیشە عومەر لە دەورت گەڕێ

ژیـان بێ عیشـق هیـچ مانـای نییە

بە ئەشقەوە ژین چەرخی ئەگەڕێ

٢٠٢٢/٥/١٢



**پیریو پەرومردگار..**

**شەلم ئەکـەی گێـڕم ئەکەی**

**کەڕم ئەکەی کوێرم ئەکەی**

**بـێ تـاوانـم سـزام ئـەدەی**

**کەس ناتـوانێ بڵـێ نەکەی!**

٢٠٢٢/٥/١٣



**تێفکـرە برا چـۆن هاتوویتـە بوون**

**ژیـان دمرفەتـە پـڕە لە ئەزموون**

**هـەتـا ئـەتـوانی بەخـتـەومر بـژی**

**چی گیانلەبەرە ئەچێ بۆ تیاچوون**

٢٠٢٢/٥/١٣



دڵـم زۆر پەسـتە شـادی ناهـێنـێ

ژین کە ناخۆشبێ چی بۆ من دێنێ

بۆ ئەبێ ژیـان وابەسـتەی خەمبێ

داوا لـە کـێ کـەم تـۆڵـەم بسێنێ

٢٠٢٢/٥/١٨



گـونـاهـم چـیـیـە کـەوا مـن کـوردم

هەمیشـە لە ژیـن بۆ دوژمـن پردم

لەوەتەی کە هەین خۆمان خواردووە

لـە نـاو گـەلانـا ئـابـڕوومـان چـووە

٢٠٢٢/٥/٢٤



چۆن لە پێستی خۆم من نەچمە دەرێ

بەڕێوەبردن وا لە دەست کەرێ

هیچ شت نەماوە بۆ دڵخۆشکەری

زەمانە وایکرد غیرەتمان بەرێ

٢٠٢٢/٥/٢٤



ئەگەر ئەتەوێ لە ژین سڕنەبی

باوەڕ بەخۆبە لە جووڵەیابی

بێ جووڵەو باوەڕ جەستە مردووە

ورەت بەرزبێ سەرکەوتوو ئەبی

٢٠٢٢/٥/٢٥



بڕوات بەخۆتبێ ورەت بەرزبێ

خۆت پەیداکەربە رقت لە قەرزبێ

هیچ کات ناکەویە بەر لۆمەی خەڵکی

جێگەی ڕێز ئەبی سەرت بەرزبێ

٢٠٢٢/٥/٢٥



خۆزگە ئەخوازم بەوەی بێ ئەقڵە

بۆ ئەقڵداران هەر ئەوە چەقڵە

ئەقڵ بۆ ئاقڵ بارگرانییە

بۆ کاڵفامەکان شیرینیو نوقڵە

٢٠٢٢/٦/١٢



ژیـان بـۆ مـرۆڤ کـەفـوکـوڵێکە

تەمەنێکی کورت گەرم و گوڕێکە

کێ چاکەخوازبێ شکۆ بۆ ئەوە

لە دوای مەرگیشی بەختەروەرێکە

٢٠٢٢/٦/١٦



بۆ کەسێکی خۆشەویست..

دەستکەرە ملم عومەر زۆر پەستە

سوکنایی دڵمی عومەر وەک کەستە

هێند خۆشمئەوێی بە دڵ و بە گیان

خۆشەویستی تۆ گەیانمیە رستە

٢٠٢٢/٦/١٧



خوشکێکی بەڕێز تێر ماچیکردم
لە هەست و سۆزا کاری تێکردم
وتی ئاغا گیان با دەستت ماچکەم
وتم سەلماندت بڵێم کچەکەم

لەسەر کورسیەکەم لەبەردەم دوکانەکەم دانیشتبووم، ئەو خوشکە بەو شێوەیە هەڵوێستی بەرامبەرم نواند، کە شایستەی ئەو چوارینەیەبێت.. وتی با دەستیشت ماچکەم، وەك باوکم و براکانم خۆشمئەوێت، فرمێسکیش بە چاویا هاتە خوارەوەو منیشی خستە گریان...

٢٠٢٢/٦/٢٩



لە سفرەوە هاتووم گەشتوومەتە سەد

بە هەوڵ و کۆشش پێکاومە مەقسەد

بەرهەمی مرۆڤ زادەی کۆششبێ

دڵفراوانبێ دوورلەبێ لە دەرد

٢٠٢٢/٦/٣٠



فرمێسکم بەخوڕ هاتە خوارەوە

یەک نامەم نەدی لەلای یارەوە

ژیانێ ئەشقی تیا نەیەتەدی

هەڵواسراوێکم وام بە دارەوە

٢٠٢٢/٧/١٧



لوت بەرزمەکە لە ئاست بەرامبەر

لە کەسایەتی خۆت مەیە زەرەر

ڕێزی ئەو بگرە ڕێز لەخۆت ئەگری

مرۆڤێک ئەبی شادو بەختەوەر

٢٠٢٢/٧/١٧



ئەمەوێ بمرم هیچم نەمێنێ

هەرچی یاومەتێ با لێم بسێنێ

ئەمسەر تا ئەوسەر مایەپووچ دەرچووم

بۆم درکەوت ژیان پوولێ ناهێنی

٢٠٢٢/٧/١٩



قەت نەکەی کڕنووش بۆ هیچ کەس بەری
خـۆت بـاش بنـاسـە لێـیـبـە بێـبـەری
مــرۆڤ لــە لای مــن گــەورەو پـیــرۆزن
بــۆ خـۆپـاراسـتـن نـموونــەی هـێـزن

٢٠٢٢/٧/٢٠



ئەبێ پێبـکەنم بەم چەرخ و دەورە
کەسی بێبەرهـەم ئەکا بە گەورە
مرۆڤ شـایستەی کـاری خۆیـەتـی
میللەت پەژارەو دەسەڵات تەورە

٢٠٢٢/٧/٢٢



ژیان چەند تاڵبێ لام هەر شیرینە

تـاڵی وەلاتـێ بەشـت هەنگـوینـە

ورەت بـەرزبـێ بـەختـەوەر ئـەبی

بۆ هەمووان وایە ئەم سەرزەمینە

٢٠٢٢/٧/٢٥



بۆم دەرکەوت ژیـان بە درۆ بەندە

بەرزو نـزمـیـیـە هـەر شیوو کەنـدە

راسـتـی تـیـا نـیـیـە درۆ بـوتـە بـاو

من یەک جار بڵێم تۆ سەد ئەوەندە

٢٠٢٢/٧/٢٥



ڕێگەم هەڵەکرد کەوتمە دوای ڕاستی

پێیرانەگەشتم نەگەیمە خواستی

چە ڕۆژێکە وا ئێمەی تێکەوتووین

کوا سەنگی مرۆڤ لە کوێیە ئاستی

٢٠٢٢/٧/٢٧



وەفاو متمانە، ڕێز، خۆشەویستی

بۆ هەر کەسێکە نەڕوا لە دەستی

هەرکات کە بوویتە ئەو چوار هەستیارە

مرۆڤێک ئەبی ناوبانگت دیارە

٢٠٢٢/٧/٢٩



**مێرو کە باری لە خۆی زیاترە**

**بەڵام بەرهەمی گەورە چاترە**

**وانـەیـەکـ ئەدا بە لاوازەکان**

**بەرەنگـارییـە، ورەیە بۆ ژیان**

٢٠٢٢/٧/٣٠



**رەخنەم لێمەگرن هەرچیم وتووە**

**هەر داخی دڵمـە هەڵمڕشـتـووە**

**هەموو ئەزانیـن مـردن لەڕێـیە**

**ئاغـا ئەوەنـدەی لێتێگـەشتووە**

٢٠٢٢/٧/٣٠



دەستکەرە ملم زۆر بێتاقەتم

بڕوانە شێوەم پیرو شەکەتم

گەنجیم بەرێکرد ناگەڕێتەوە

ئەما گڕو تین کوانێ هەڵمەتم

(لە هەستی کەسێکی دڵسۆزەوە،

کە پەرۆشی خۆی بەرامبەرم نوواند).



ئەگەر ئەتەوێ لای من بەرێزبی

کەسی دڵسۆزو بەچێژو پێزبی

نەکەی بە هیچ جۆر درۆم لەگەڵکەی

ئاستت نشێوکەی وەک کەری دێزبی

٢٠٢٢/٨/٤



ئەڵێن سبەینێ عەزابی قەبرە
خەڵکە لە داخا دەوەرە مەمرە
ژیان هەر بۆ خۆی جۆرێ سزایە
ئیتر بۆ قەبر عەزابی تیایە؟!



لە گەرمەی هێزا هەڵوێست دیارە
کەسێک شیاوە جێگەی لەبارە
بەڵام داخەکەم پێچەوانەیە
هەر نالەبارە ئەمڕۆ دەستدارە

٢٠٢٢/٨/١٠



پایـز هاتـەوە بـۆ کـۆکـەو پـژمـین

لە سەرما دووربین ئەبێ پۆشتەبین

خوا بـمـانپـارێـزێ لـە میزەچورکە

ئاگـادار نـەبیـن حساب بـۆ تـرکـە

**تێبینی**: هەمان مەبەست بە جۆرێکیتر لە کەشـکۆڵەکانما

تۆمار کراوە.. کۆتاییەکەی بەم شێوەیەش ئەبێ:

دۆعای خیر بکەن بۆ میـزەچورکە

ئەوسا دوور ئەبین لە ناڵەو نرکە

هـەتـا ئەتـوانی پـارێـز لـە تـرکـە

ژیان ئەگۆڕێ هەر بە یەک چرکە

بـە تـەنـدروسـتـی ژیـانـت پـرکـە

وەکو وەرز، پایز لە هەموو وەرزەکانیتر خۆشترە،

کۆکەرەوەی بەروبوومی ساڵانەیە..



ئەڵێن پێ بەقەد بەڕەت ڕاکێشە

ژیـانـی ئـەمـڕۆ پـڕە لـە کێـشـە

حەزو ئارەزووت دەستەبەر نەبێ

ژیان هیـچ نییە بێ لە سەرئێشـە

٢٠٢٢/٨/١٧



هەموو هەوڵەیەین سامانمان زۆربێ

بیـر ناکەینـەوە پاداشـمان گـۆڕبـێ

کە زۆریشـت بوو بەرهەمت بۆربێ

سـەرت یـەشـێنێ ژیـانـت قـوڕبێ

٢٠٢٢/٨/١٨



## وەکو چوارینە سکاڵایەك..

ئەگەر زەمینەم بۆ برەخسایە

لە کارکردنا ئاستم هەبوایە

رێگەی خزمەتم ئەهاتە کایە

ناحەز زۆر ئەبوو جا کەی رەوایە

٢٠٢٢/٨/١٩



چیم بەرهەمهێناوە بێ ئەرک نەبووە

زۆر هیلاکیم چێشت شەونخونیم کردووە

ئەوەی دەرحەقم مافم ناداتێ

دڵنیام لەوەی غەدری کردووە

٢٠٢٢/٨/١٩



**هەر رۆژێ هەستایت رۆژێکی نوێیە**

**هەموو رۆژێکیش پەیامی پێیە**

**بەرووی گەشەوە پێشوازی لێکە**

**باوەڕ بەخۆبیت کارت بەجێیە**

٢٠٢٢/٨/٢٠



**سکالایەك لەدەست وەچەی خراپو بێنەمەك، کە زۆربەی باوکان بەتایبەتیو دایکانیش پێوەی ئەناڵێنن..**

**دڵم ئێشاوە لە وەچەی ئەمڕۆ**

**چیم بەرهەمهێنا رۆیشت بەفیڕۆ**

**وەسیەتم وایە بۆ باوکو دایکان**

**بە خۆشەویستی نەبن دەستخەڕۆ**

٢٠٢٢/٨/٢٠



خۆزگەم بەو کەسەی بێهۆش و گۆشە

دوور لە پـەژارەو خـۆشـی لە کۆشـە

مـرۆڤی هـۆشـمـەنـد بەختەوەرنابێ

نـاشـتـوانێ بڵـێ ئەم ژینـە بۆشـە

٢٠٢٢/٨/٢٠



پێـمئـەڵێـن ئاغـا شـار چاک گـۆڕاوە

دانیشتووی رەسەن بەدەگمەن ماوە

خـۆ خوانـەکـردە ئێـوەش نەمێنن

ئەوساکە بڵێـیـن شار کێی تیا ماوە؟!

٢٠٢٢/٨/٢٢



هەتا ئەتوانن رێز لە یەک بگرن

ئەتوانم بڵێم ئاستێک وەرئەگرن

ژیان هەر ئەڕوا زوو ئەبڕێتەوە

بە تەنها رێزە جێی ئەگرێتەوە

٢٠٢٢/٨/٢٢



هەندێ پێمئەڵێن ئاغا تۆش پیربووی

کە وات پێبڵێین خۆ زویر نەبووی؟

بۆچی زویربم ژیان هەر وایە

تەمەن درێژبێ پیری لە دوایە

٢٠٢٢/٨/٢٨



خۆمو هاوسەرەکەم دوو بە دوو لەماڵەوە دانیشتبووین، هیچ ئاخاوتنێك نەمابوو کە لە نێوانماندابێ.. من ئەمڕوانییە ئەو، ئەویش لە من، هەردوکیشمان ماندوین، بێهێزو توانایین، لە سەروو حەفتاوەین.. یادی رابوردووم بە خەیاڵ ئەکردەوە، کە چۆن بووینو ئێستا چۆنین؟! سکاڵای دڵم بەم چوارینەیە دەربڕی بە شێخ رەزایی بۆی دەرچووم..

نە سەرم ماوە نە کێر

نە مریشک ماوە نە کەڵەشێر

هێندە شەکەتو ماندووین

هیچ سوود نابینین لە خێر

٢٠٢٢/٨/٢٨



ئـەمـــەوێ بـژیـــم تـاکـــو ببـیـنـــم
بـە خـۆشــەویـسـتـی داخـوازی ژیـنـم
ژیـان چـەنـد تـاڵـبـێ نـامـەوێ بـمـرم
بە هەڵوێستی جوان من بەرگەی ئەگرم

٢٠٢٢/٨/٢٩



تەمەن خێرایە زوو دێـتو دەڕوا
درۆش زۆربـووە نـەمـاوە بـڕوا
پـەرتـو بڵاویـن دژی یەکتـرین
ژیان بـەو جـۆرە بـەڕێوە ئـەڕوا

٢٠٢٢/٨/٢٩



زانست رەهایە بۆ دەربڕین

کەچی ڕێ لە ئەدەب ئەگرین

زانستو ئەدەب ڕێبەری ژیانن

بیرت وا نەبێ ئەڵێن نەزانن

٢٠٢٢/٨/٣٠



بە بوونی خەڵک ئەبێ بڵێم هەم

پەیامم گەییوە بە بوونی بەرهەم

بە تەنها مرۆڤ هیچی پێناکرێ

بەهۆی خەڵکەوە ئاستێک وەرئەگرێ

٢٠٢٢/٨/٣٠



**سـکالا...**

سـەرت لێسـەنـدم بـەریشـم سڕە

چیشـم پەیـاکـرد هەر هەمووی تڕە

کە بـەر نەمێنیٚ سەریش تەسلیمە

هەرچیشـم هەبـێ هـەر ئەڵێم نیمە

(لەکوێیە بەهەشت؟ کوانێ نەعیمە؟)

٢٠٢٢/٨/٣١



مـادە بکەیتـە سـەروەر

ئاخ هەڵلەکێشی بۆ کەر

مەحـاڵـە بی بەختـەوەر

خۆت ئەکەیتە جانەوەر

٢٠٢٢/٩/٧



دیاری دەستم هەر پێنووسە

پێنووسە کەوا دادنووسە

ئەوەی خیانەت لە خاک بکات

پێنووسە کە بڵێ جاسووسە

(واتە پێنووس هێزە توانایە بەڵگەیە)

٢٠٢٢/٩/٧



**پێنووس..**

پێنووسەکەم دادمە

نانم نەبێ زادمە

کەسم نەبێ خادمە

هەمیشە لە یادمە

٢٠٢٢/٩/٧



زۆرمان بڕیوە کەم بەڕێـوەیە

نووسـینەکانم هەر لە جێـوەیە

ئامـۆژگـارییە خێری پێوەیە

باش لێم تێبگەن مرۆڤ بێوەیە

٢٠٢٢/٩/١١



## وێـنــە..

وێـنـە نیـوەی بیـنیـنـە

وێـنـە شـاییـە شـیـنـە

وێـنـە بەڵگەی مێـژووە

وێـنــە کـاری لـەڕووە

٢٠٢٢/٩/١٨



وەختە لە پێستم بچمەدەرێ

کەس نییە بمباتە دەرێ

لە جێگەی خۆم قەتیس ماوم

تەمەنیش وا چوّتە سەرێ

تێبینی: ئارەزووم گەشتەو هاورێی سەفەر نییە، هەڵکشاوی تەمەنیش تەنگی پێهەڵچنیوم و پەنگی پێخواردووم..

٢٠٢٢/٩/١٨



ئـاو...

بەردەوامی ژیان پێویستی ئاوە

ئەگەر ئاو نەبێ گیاندار فەوتاوە

وتـراوە کـە ئـاو ئاوەدانییـە

بەبێ ئاو ژیان هیچی تیا نییە

تێبینی: خوا لە قورئان ئەفەرموێ: (وجعلنا من الماء كل شيء حي)، (لولا الماء هلك الأحياء)..



پەنام بردە بەر خورما

هێزێ بکا بە بەرما

جەستەم ساردو سڕبووە

کاری تێناکا گەرما

٢٠٢٢/٩/١٥



ئەمساڵمان ساڵێکی نوێیە

مژدەی سەرکەوتنی پێیە

قوتابیان هەموو ئامادەن

کاری خوێندنیان بەجێیە

کردنەوەی قوتابخانەکان...

٢٠٢٢/٩/١٣



تەمەن سەریکرد ئاگات لەخۆتبێ

بە هیچ پزیشکێ منەتت نەبێ

ئەبێ هەوڵدەی پزیشکی خۆتبی

نەک نەخۆشکەوی ژێردەستەی ئەوبی

... پیری و پاییز.. لە گەرماوە بۆ سەرما!!



ئارامی دڵم بە مۆزیکایە

مۆزیکا نەبێ دڵم چی تیایە؟!

کێیە کە بڵێ مۆزیک حەرامە

ئەوە خواست نییە دوور لە مەرامە

٢٠٢٢/٩/٢٤



زۆر شت بۆچوونە نەوەک بەڵگەیە

من ئەڵێم نییە ئەو ئەڵێ هەیە

هەر شتێ کەوتە باری شکەوە

فەرامۆشیکە بۆ خۆت لێیخەوە

٢٠٢٢/٩/٢٧



ژیان لای من جرتو فرتە

پاداشتەکەی تاکێ جڕتە

تکایە با باش بیزانی

بەرهەمەکەشی بۆ خرتە

٢٠٢٢/١٠/١٤



نە پیـاوی کەسم نە کەس پیاومە

ئەوەی کە چـاکە نـووری چـاومـە

مرۆڤ لە ژینیا ڕێز لەخـۆی بگرێ

لای من پەسەندە هێزو هەناومە

٢٠٢٢/١٠/١٣



دڵـم خۆشـە بـەو خەڵکـە

ئەو خەڵکە بۆ من کەڵکە

ئـەگـەر لێیان دابـڕێـم

ژیـان لای من بێـکـەڵـکـە

٢٠٢٢/١٠/١٥



ئەمـەوێ خەڵکی دەم بەخەندەبێ

لە بـەری ژیـان هـیـچی کەمـنـەبێ

بە نـارەوایـی جـێگـەی زەمـنـەبێ

بۆ خۆشەویستی تووشی دەرنەبێ

٢٠٢٢/١٠/١٥



تەمەنم سەرکەوت دەستم کەوتە پشت

لـە تـاک بێـزارم چیـمـداوە لە گشـت

لەمسەر تا ئەوسەر مایەپووچ دەرچووم

هـیـچم پێنەبڕا بە تەنها یەک شت

٢٠٢٣/٣/٢٣



بژێوی ژیانت کەوتە دەست ناحەز

چاوەڕێ بکە بیت بە چەق و بەز

ناحەز ناحەزە کە تەسلیمی بووی

داتئەتەکێنێ وەکو بەری رەز

٢٠٢٣/٧/٢٥

تێبینی:

دواکەوتنی مووچەی مووچەخۆرانی هەرێمیان

خستە ئەستۆی حکومەتی فیدراڵی!



هەتا ئەتوانی داوای قەرز مەکە

نەبا قەرزەکەت بۆ بێتە لەکە

نەکەی بۆ ژیان زیادەڕەویکەی

دەستگیرۆیی خۆت باشترین چەکە

٢٠٢٣/٨/٧



**هەتا ئەتـوانن دووربن لە تووڕە**

**با نەتـسـووتێـنێ ئاگـری کوورە**

**بەرهەمی کاری نەشیاو تووڕەیە**

**کە ڕێچکەی بگری ژیان کوورەیە**

٢٠٢٣/٨/١٦



**ژیان هەر ئەڕوا بەرەو کۆتایە**

**کردەوەی چاکە، کە لەبن نایە**

**دیـارە هەلێـکە بۆ چاکەکـردن**

**ئیتر بۆ تەمەن بیەین بە زایە**

٢٠٢٣/٨/٢٣



پیتم خستەکار بۆ وشەو رستە

مانام پێبەخشی بوو بە کەرەستە

ئەتوانم بڵێم دەربڕی هەستە

کە لێم تێبگەی پێتئەڵێم بەستە

٢٠٢٣/٩/٧



نە زەوقم ماوە نە شەوق

ژینم لێبووە بە تەوق

پیری شەکەتی کردووم

هاکا درامە بەر سەوق

٢٠٢٣/١٠/٣



دڵم هێند تەنگە گریانی ئەوێ

چاوەڕێی چاوە فرمێسکی ئەوێ

لابەری تەنگی، فرمێسکی چاوە

داڵدەی مرۆڤە کە وا خوڵقاوە

٢٠٢٣/١٠/٤



بە خەندەی درۆ مەبن دەرسخەڕۆ

کە دەستی بڕین بڵێن باوکەڕۆ

کە ریکلام زۆربوو باوەڕ کەم ئەبێ

باش لێم تێبگەن ماست ناکەن بە دۆ

٢٠٢٣/١٠/١٠



ئـەمڕۆ سـاڵرۆژی یـادی "لـۆزان"بوو
یـادی گـەوزانی گـەلـی کـوردان بــوو
کـوردسـتان کـرا بـە چـوار پـارچـەوە
هەتاکو ئێسـتاش بەشـی کورد نەبوو!



(لۆزان)، ئەو ڕێکەوتنە گرنگەی نێوان نوێنەری بەریتانیا (سێر هۆراس رمبولد)و تورکەکانە، کە لە ۱۹۲۳/۷/۲٤ لە شاری لۆزانی سویسرا ئەنجامدرا. کاتێك باس لە سەد ساڵی رابردووی ئەو پەیماننامەیە دەکەین، دەبێت پشتخانێکی زانستیمان هەبێت لەسەر ئەو ڕووداوانەی بەهۆکاری چەند بڕگەیەك لەو ماددانە کوردی لە هیوای هەڵچنراوی خەونی سەربەخۆیی دوورخستەوە، ئەوەی لەو پەیماننامەیەی نێوان نوێنەری بەریتانیاو تورکەکاندا هاتووە، کە لە پای وازهێنانی تورکە عوسمانییەکان لەو مافانەی بۆ خۆیان بە ڕەوایان دەزانی لە عێراق‌و سوریاو فەلەستین‌و میسرو قوبرس‌و لیبیا، بەو مەرجەی ئەرمینیاو باکوری کوردستان لە تورکیا دانەبڕێت، چونکە چەند بڕگەیەك لە ماددەکانی پەیماننامەی سیڤەر ئەو هەقەی دابوو بە کوردو ئەرمەنی لە پرۆسەیەکی راپرسیدا ئەگەر بڕیاریاندا جیاببنەوە لە تورك‌و سەربەخۆیی خۆیان رابگەیەنن، یاخود لەگەڵ تورکدا بمێننەوە. دوای لۆزان ئەو خەونەی کوردو ئەرمەن لەگۆڕنراو کورد لە تونێلێکی تاریکدا بەجێهێڵراو کەس ناوڕێکی خێری لێنەدایەوە، بۆیە بیرکردنەوە لەو دۆخە ناهەموارە تەنها پەنابردنە بەر چەك‌و خۆپاراستنبوو لە دابونەریت‌و کلتوورو مێژووەکەی، بەرگریکردن بوو لە خاك‌و زێدی خۆی. ئەمەش خۆڕێکخستنی دەویست‌و پێویستی بە ڕێکخراوێکی سیاسی بوو، هەر لەو سەروبەندەدا کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستان دامەزرا. ئەمە جگە لە بوونی کۆمەڵەی خۆیبوون.

لەو بارودۆخە ناهەموارەی کورددا تورکە شۆڤێنییەکان هێدی هێدی لە دەسەلاّتی ڕەهای ولاّت نزیك دەبوونەوە. لە ٢٩ی تشرینی ١٩٢٣ بڕیاریاندا سیستەمی دەسەلاّت لە خەلافەتەوە بگۆڕن بۆ کۆماریو مستەفا کەمال وەك سەرۆك دیاریکراو پاشان بە فەرمی مستەفا کەمال هەتا کۆتایی ژیانی وەك سەرۆکی تورکیا مایەوە.

لە ١٩٢٤/٣/٢٤ دوا خەلیفەی عوسمانی سوڵتان ڕەشادی شەشەم ولاّتی جێهێشت، ئەمە گەورەترین وەرچەرخانی سیاسی بوو، بە یەکجاری ولاّت کەوتە بندەستی تورکە شۆڤێنییەکانەوە، کورد بە ناچاری پەنای بردە بەر چەكو بەرگری لە بوونی خۆی دەکرد، نەوەبوو شێخ سەعیدی پیران بووە سەرمەشقی ئەو بەرگرییەو پاش چەند مانگێك کۆتاییان پێهێنا، کۆتایی بە شۆڕشو گیانی خۆیو هاوڕێکانی هات.

